ئەرەستۆ

# هونەری شیعر

## (شیعر ناسی)

وەرگێرانی لە ئینگلیزی و
پێشەکی و پەراوێزی:
عەزیز گەردی

2011
چاپی دووەم

ئەرەستۆ

# هونەری شیعر

## ( شیعر ناسی )

وەرگێڕانی لەئینگلیزیو پێشەکیو پەراوێزی:
عەزیز گەردی

چاپی دووەم

سلێمانی ............................................... ٢٠١١

## لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە 24




## ناسنامەی كتێب






### هونەری شیعر ( شیعر ناسی )




نوسینی: ئەرەستۆ

وەرگێڕانی لەئینگلیزیەوە و پێشەكی و پەراوێزی: عەزیز گەردی

بابەت: لێكۆڵینەوەی ئەدەبی

تایپ و نەخشەسازی: ئیدریس شەیداهۆ

بەرگ: فەرهاد مەلا حەسەن

تیراژ: ١٠٠٠

نۆبەت و ساڵی چاپ: دووەم ، ٢٠١١

شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

ژمارەی سپاردن: (٨٣٦)ی ساڵی (٢٠٠٤)دراوەتێ



ناونیشان

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# کورتەی ژیانی ئەرەستۆ ( ٣٨٤ – ٣٢٢ پ . ز )

ئەرەستۆ ساڵی ٣٨٤ پ. ز لەشارۆچکەی (ستاگیرا) ی هەرێمی (تراکیا) لەدایك بووە. (ستاگیرا) کەپاشان بوو بە (ستاڤرۆ)، دەکەوێتە نزیك شاری (سالونیکا) لەباکووری دوورگەی یۆنانو دەوری ٣٠٠ کم لەئاتین دوورە. واتە ئەرەستۆ وەکوو ئەفلاتوونو سوکرات ئاتینی نەبوو. کاتێ ئەرەستۆ هاتە دونیا، سوکرات (١٥) ساڵ بوو و ئەفلاتون تەمەنی (٤٣) ساڵ بوو و نزیکەی دوو ساڵ بوو ئەکادیمیاکەی دامەزراندبوو. ئەرەستۆ زۆربەی سەردەمی منداڵی لە(بیلا)ی پایتەختی هەرێمی (مەکدۆنیا) لەنیمچە دوورگەی (بەلکان) بەسەر برد. (نیکۆماخوس) ی باوکی ئەرەستۆ برادەرو پزیشکی تایبەتی (ئەمنیتاس)ی دووەمی پادشای (مەکدۆنیا) و باوکی فیلیب و باپیری ئەسکەندەری گەورە بوو.

ئەوسا پیشەو کارو کاسبی بەبەرەباب بوو، کوڕ دەچووە دوای پیشەی باوکی ، جا لەبەرئەوەی بنەماڵەی ئەرەستۆ پشتاو پشت بەپزیشك هاتبوونە خوارێ ئەویش سەرەتا رووی کردە خوێندنی پزیشکی. بنەماڵەی ئەرەستۆش وەکوو هەموو ماڵباتێکی ناوداری پزیشکی رەچەڵەکی خۆیان دەبردەوە سەر (ئەسکلیپیوس)ی پزیشکی ناوداری یۆنانی.

ئەرەستۆ، کەباوکی مرد، خزمێکی خۆی کەناوی (پرۆکسینوس) بوو، گرتیە خۆیو بەخێوی کرد.

ئەرەستۆ لەتەمەنی حەڤدە هەژدە ساڵیدا بوو کەچووە ئاتین بۆ ئەوەی لەئەکادیمیای ئەفلاتوون بخوێنێ. دەڵێن کەچووە ئاتین ئەفلاتوون لەسقلیە بوو. ئەرەستۆ لای مامۆستاکانی ئەکادیمیا دەستی بەخوێندن کرد تا ئەفلاتوون هاتەوە. ئیتر لەوساوە بوو بەشاگردێکی وەفاداری ئەفلاتوون.

ئەرەستۆ کاتێ کەچووە ئاتین گەنجێکی بیانی پۆشتەو پەرداخ و ناسك و رەوشت بەرز بوو، هەموو شاگردەکان بەچاوێکی سەیر سەیریان دەکرد. کە ئەفلاتونیش یەکەم جار چاوی پێکەوت و بینی ئەوەندە بایەخ بەئەدگارو جل وبەرگی دەدا گوتی: ( واچاکە کەمتر بایەخ بەجل وبەرگت بدەی و زیاتر خەریکی پەروەردەکردنی عەقڵت بی) بەلاّم هەر زوو بۆی دەرکەوت کەئەرەستۆ خاوەنی گەورەترین عەقڵی دونیای ئەوسایە، بۆیە ناوی نا (عەقڵ)و (زۆر خوێن)، تەنانەت کەباسی ئەکادیمیاکەی خۆیشی دەکرد دەیگوت: ئەکادیمیا دوو بەشە: لەش و عەقڵە، هەموو شاگردەکان لەش و ئەرەستۆ عەقڵە. کەباسی ماڵی ئەرەستۆشی دەکرد دەیگوت ( ماڵی کابرای خوێنەر).

ئەرەستۆ (٢٠) ساڵ لەخزمەت ئەفلاتوون مایەوە. مامۆستاو شاگرد هەمیشە رێزو خۆشەویستیان بۆ یەکتر هەبوو.

ساڵی ٣٤٧، کەئەفلاتون مرد، (سبویسیبس) بوو بەسەرۆکی ئەکادیمیاو ئەرەستۆ لەبەرئەوەی خۆی بۆ ئەم پایە بەشایانتر دەزانی، زویر بوو و ئاتینی بەجێهێشت بەلاّم نەیتوانی بچێتەوە زێدی خۆی چونکە لەکاتی هێرشە فراوانخوازییەکانی فلیپ پاشا، خاپوور کرابوو. چوود (ئاسۆس) کەکەوتبووە کەناری ئاسیای بچووك و چووە لای (هرمیاس)ی هاورێی کەپێکەوە شاگردبوون و ئەوسا ببوو بەفەرمانرەوای

شاری (ئەتارتیس) . هیرماس، هەندێ دەڵێن خوشکی خۆی و هەندێ دەڵێن کچی خوشکی خۆی دایە ئەرەستۆ کەناوی (پوتیاس) بوو و کچێکی بوو ژنەکە بەناوی خۆی کرد، واتە ناوی نا (پوتیاس).

ئەرەستۆ ساڵی ٣٤٥ چووە شاری (میتیلین) لەدوورگەی (لسبۆس) لەدەریای ئەرخەبیل، (تیوفراتوس)ی هاورێی لەوێ فەرمانڕەوا بوو. لەوێ بوو کە داوەتێکی لەفیلیب پاشاوە بۆ هات بۆ ئەوەی بچێ ببێ بەڵەلەو مامۆستای ئەسکەندەری کوڕی. کەچوو ئەسکەندەر تەمەنی (١٣) ساڵ بوو. تەماشای کردماڵە پاشایەکی ناکۆك و پڕ ئاژاوەیە. (فیلیب) و (ئۆلیمبیاس) ی ژنی هەمیشە لەکێشەو ململانەدا بوون و زۆر جار دەبوو بەشەڕیان ، ئەسکەندەریش مێردمنداڵێکی عاتیفی و فێدارو شەرابخۆر بوو، مەراقی ماڵی کردنی ئەسپی کێوی بوو، ئەسکەندەر زۆر ڕێزی ئەرەستۆی دەگرت و بەباوکی خۆی دادەنا، دەیگوت باوکم ژیانی پێ بەخشیوم و ئەرەستۆی مامۆستام فێری هونەری ژیانی کردووم. ئەرەستۆ چوار ساڵ خەریکی دەرزدان و پەروەردەی ئەسکەندەر بوو: بەڵام ئەسکەندەر لەبەرئەوەی مێشکی بەدونیاو فراوانکردنی دەسەڵاتەکەیەوە خەریك بوو، چیتر دەرزی لا نەخوێند، چونکە وای دەزانی ئەرەستۆ دەبێ بەلەمپەر لەبەردەم بەدیهێنانی ئاواتە گەورەکانی، بەڵام پیاوەکانی خۆی ڕاسپارد کەهەموو هاوکارییەکی ئەرەستۆ بکەن و چی کەرەستەی پێ دەوێ بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی بیخەنە بەر دەستی. فەرمانی بەڕاوکەرو بیستانەوان و ماسیگرەکان کرد رووەك و گیانداری بۆ ئامادە بکەن بۆ ئەوەی بتوانێ کارە زانستیەکانی بەچاکی ئەنجام بدا. دەڵێن لەئاسیاو ئەوروپا (١٠٠٠) کەس خەریکی کۆکردنەوەی پێداویستی لێکۆڵینەوەی زانستی بوون بۆ ئەرەستۆ.

**ئەرەستۆ خاوەنی سێ گەنجینە بوو لەو سەردەمەدا کەس شتی وای بۆ مەیسەر نەدەبوو:**

ا- باخچەیەکی ئاژەڵان.

ب - مووزەخانەیەکی سروشتی.

ج - کتێبخانەیەکی پڕ دەستنووس.

دوای ئەودی فیلیب پاشا بەفیتی ژنەکەی کوژرا، ئەسکەندەر هەوای گەورەیی لەسەری دا و پەلپی بەئەرەستۆ گرت، یەکەم جار لەسەری (کالیتینس)ی کوڕی خوشکی دا چونکە رازی نەبوو ئەسکەندەر بپەرستێ. ئەرەستۆش لەخۆی ترساو مەکدۆنیای جێهێشتو چووەوە ئاتین دوای ١٢ ساڵ دوورکەوتنەوە، قوتابخانەیەکی لەپەڕگەی شار دروست کرد لە(گۆڕەپانی ئەپۆلۆ کۆلیوس) لەبەرئەوەی خۆی ئاتینی نەبوو، بێگانە بوو، نەدەبوو مولکی ئاتینی بەناو بکرێ ئەوەبوو مولکەکەی بەناوی (لیوفراستوس) ی هاوڕێی کرد. قوتابخانەکەی بەناوی (لوکیۆن) یان (لوسیوم) بوو.

قوتابخانەکەی زۆر قوتابی تێدا بوو، لەناوخۆیانەوە دەستوورێکی وردی ژیانو گوزەرانیان پێکەوە نابوو. هەر دە رۆژ یەکێکیان هەڵدەبژارد بۆ سەرپەرشتی قوتابخانەکە. مامۆستاو قوتابی بەیەکەوە نانیان دەخوارد.

خوێندنی قوتابخانەکەی ئەرەستۆو پرۆگرامو قوتابییەکانی جیابوون لەودی ئەفلاتوون. ئەفلاتوون زیاتر بایەخی بەگوتنەوەی بیرکاریو فەلسەفەی سیاسی دەدا، کەچی ئەرەستۆ گرنگی دەخستە سەر

زیندەرەزانیو زانستی سروشتی هەر ئەمەش بوو وای لێکرد بەدوای کۆکردنەوەی گیاندارو کەرەستەی سروشتیدا بگەڕێ.

قوتابییەکانی قوتابخانەکەی ئەرەستۆ بەپێی تەمەن کرابوون بەدوو جۆر: ا ـ پیرو بەساڵاچووەکان . ب ـ گەنجەکان.

کاتی خوێندنیش بەدوو کات دەست نیشانکرابوو، بەیانیانو پاش نیوەڕۆیان:

بەیانیان: زۆر قوتابی ئامادە دەبوون، وانەی بورهانو سروشتو میتافیزیك دەگوترایەوە.

پاش نیوەڕۆیان: قوتابی کەمتر بوون، هەموو شاگردی تایبەتیو پێرەوکەری خۆی بوون. وانەی حیکمەتو شیعرو گوتاردان دەگوترایەوە.

چۆنیەتی دەرز گوتنەوەش بەهاتو چۆ بوو. واتە بەپیاسە کردن بوو. ئەرەستۆ لەناو باخچەو گوڵو گوڵزاری قوتابخانەکەی پیاسەی دەکردو دەرزی دەگوتەوەو قوتابییەکانی لەتەنیشتی دەڕۆیشتنو دەرزەکەیان لێ وەردەگرت. بۆیە بەقوتابخانەکەیان دەگوت قوتابخانەی هاتو چۆ peripateicos ) و بەقوتابییەکانیشیان دەگوت (هاتوچۆکەران).

لەو ماوەی ئەرەستۆ خەریکی بەڕێوەبردنی ئەم قوتابخانەیە بوو، (پوتیاس)ی خێزانی کۆچی دوایی کردو دۆستێکی گرت بەناوی (هربلیس)،خەڵکی (ستاگیرا)ی زێدی خۆی بوو. کوڕێکی لێ بوو، بەناوی باوکی خۆی کردو کتێبێکی رەوشتپەروەریشی نووسی ئاراستەی ئەو کوڕەی کردوە، بەناوی (رەوشتی نیکوماخی).

دوای مردنی ئەسکەندەر لەبابل، پارتێکی ناحەزی ئەسکەندەر دەسەڵاتی مەکدۆنیای گرتە دەستو ئەرەستۆ لەبەرئەوەی کاتی خۆی

دۆستی ئەسکەندەر بوو، کەوتە بەر شالاوی ناتۆرەو تۆمەت پێ هەڵبەستنی: گوتیان ئەرەستۆ بەپێی پێویست خواکانی یۆنان ناپەرستێ، گوتیان ئەرەستۆ دڵسۆزی تەواوی بۆ مەکدۆنیا نییە، گوتیان ئەرەستۆ مێشکی لاوان تێک دەدا.. ئیتر ئەرەستۆ ترسا نەوەک لەناوی بەرن و بەسەرهاتی سوکراتیشی هەر لەبیر بوو، چۆن خەڵکی ئاتین تۆمەتیان دایە پاڵ و لەناویان برد. ئەوەبوو لەئاتین رۆیشت و قسە بەناوبانگەکەی خۆی کرد " دەرفەت بەئاتنییەکان نادەم جارێکی‌دی تاوان بەرامبەر بەفەلسەفە بکەن!" و چووە لای دایکی لە( کالسیس) و ساڵێکی پێ‌نەچوو، لە ٣٢٢ پ. ز هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.

# بەرهەمەکانی ئەرەستۆ

لەبارەی ژمارەو ناونیشانی بەرهەمەکانی ئەرەستۆ ڕاوبۆچوونی جۆراوجۆر هەیە. هەندێ دەڵێن ژمارەی بەرهەمەکانی خۆی لە (١٠٠٠) بابەت دەداو هەندێ دەڵێن دەوری (٤٠٠) کتێبی هەبووە. جگە لەوەی هەندێ ناونیشان هەن توێژەرەوەکان ناکۆکیان لەنێواندایە داخۆ ئەمانە هی ئەرەستۆن؟ یان هی ئەو نین و دراونەتە پاڵ ئەو؟ ڕەنگە لەهەندێ حاڵەتدا زێدەڕەوی لەژمارەی بەرهەمەکانی ئەرەستۆ کرابێ، بەڵام هەرچۆن بێ. ئەرەستۆ ژیانێکی یەك پارچە زانستو زانیاری هەبووە، بەخوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی و وانەگوتنەوەو نووسین. کەرەستەیەکی زۆری لێکۆڵینەوەی زانستیو سروشتی و ئاژەڵناسی و فیکری لەبەردەستدا بووە، ئەمەش یارمەتی داوە بۆئەوەی بەرهەمەکانی هەمەجۆرو قووڵو زانستیانە بن. ئەمانە گرنگترین بەرهەمی ئەرەستۆن کەتائێستا ماون:

یەکەم: بەرهەمی ژیربێژیو یاسایی:

١ـ زاراوە

٢ـ لەبارەی راڤەکردنەوە

٣ـ ژیربێژی

٤ـ هەڵەی سوفستاییەکان

٥ـ شیکردنەوەی یەکەم (بەگشتی لەبارەی پێوانەسازییە)

٦ـ شیکردنەوەی دووەم

٧ـ پیلەکە

دووەم: بەرهەمی سروشتی:

١ـ لەبارەی ئاسمانەوە

٢- گەردوون و گەندەڵی

٣- کتێبی سرووشت (٨ بەرگە)

٤- دیاردەی کەش‌و سەقا

٥- کانزا

بەشی سێیەم: بەرهەمی ئاژەڵناسی

١- لەبارەی دەروونەوە

٢- هەست‌و هەست پێکراو

٣- یادو یادکەوتنەوە

٤- خەو

٥- خەون

٦- لێکدانەوەی خەون

٧- کورتی‌و درێژی ژیان

٨- گەنجی‌و پیری

٩- هەناسەدان

بەشی چوارەم: بەرهەمی سیاسی‌و رەوشتپەروەری:

١- رەوشتی نیکوماخی

٢- سیاسەت

بەشی پێنجەم: بەرهەمی لێکۆڵینەوەی هونەری‌و زمانەوانی:

١- هونەری شیعر (شیعر ناسی - پۆیەتیکا)

٢- هونەری گوتاردان (ریتۆریکا)

# پێشەکی

دەمەوێ لەژێر ناونیشانێکی گشتی وەکوو (هونەری شیعر)[1] دا، نەك هەر تەنیا باسی ئەم هونەرە خۆی بکەم، بەڵکو باسی ئەم لایەنانەش بکەم:

جۆرە[2] جیاجیاکانی شیعرو خەسیەتی ئەرکەکانی هەر یەکێ لەو جۆرانەو[3] جۆرەکانی دارشتنی چنین (plot) [4] کە بۆ سەرکەوتنی شیعر پێویستن، لەگەڵ ژمارەو سروشتی پێکهاتەکانی[5] شیعرو هەر بابەتێکی تر کەپەیوەندی بەلێکۆڵینەوەی ئەم چەشنە بابەتانەوە هەبێ. سەرەتا بەشێوەیەکی سروشتی دەست پێ دەکەم، واتە: دەگەرێمەوە سەر بنەما[6] سەرەکییەکان.

دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی وەکوو جۆرەکانی لاساکردنەوە (imitation)، یان نواندن (representation)[7] باسی شیعری داستانی[8] و تراجیدیی[9]، شیعری کۆمیدیی[10] و شیعری دیترامبی[11] و زۆربەی ئەو ئاوازە بکەین کەبۆ نایو چەنگ[12] دانراون، بەڵام ئەمانە لەسێ لاوە لەیەك جیا دەبنەوە:

یان لەبەکارهێنانی وەسیلەی جیاواز بۆ لاسایی کردنەوە.

یان لەلاسایی کردنەوەی بابەتی جیاوازەوە[13]

یان لەلاسایی کردنەوەی بابەتەکان بەرێگاو شێوازی تەواو جیاوازەوە.

# بەشی یەکەم:

## وەسیلەی لاساکردنەوەی شیعریی

هەندێ هونەرمەند، چ بەشارەزایی بیردۆزە ـ ی بێو چ بەمەشقی دوورو درێژ بێ، دەتوانن بەهۆی لاسایی کردنەوەی شێوەو رەنگەوە[١] شت بنوێنن، هەندێکیتریش بەهۆی بەکارهێنانی دەنگەوە[٢] ئەمە ئەنجام دەدەن. لەو هونەرانەی باسم کردن ، لاسایی کردنەوە بەهۆی ئیقاعو زمانو مۆسیقاوە[٣] دابین دەبێ. ئەمانەش یان بەجیاجیا بەکار دێنو یان بەسەر یەکەوە. بەم جۆرە، هونەری نایو هونەری چەنگو هەر شتێکیی تری لەم چەشنە وەکوو هونەری ئامێرەکانی فوو[٤]؛ تەنیا ئیقاعو مۆسیقا پێك دێنن. وەسیلەی لاسایی کردنەوەی سەماکەرەکان تەنیا ئیقاعە بەبێ هاوکاریی مۆسیقا، چونکە ئەوان بەهۆی چۆنیەتی رێکخستنی ئیقاعی جوولەیان کەسێتی و هەست[٥] و کردەوەی مرۆڤ دەنوێنن.

ئەو هونەرەی تەنیا زمان بەکاردێنێ، چ شیعر بێو چ پەخشان، شیعرەکەش چ فرەکێش بێو چ بەیەك کێشی تایبەتی دارێژرابێ، تا ئێستا ناوێکی تایبەتی نییە[٦]، چونکە ئێمە یەك ناوی هاوبەشمان نییە بۆ (میمۆس)[٧]ەکانی سۆفرۆن[٨] و زینارکۆس[٩] و گفتوگۆکانی سوکرات[١٠]، یان بۆ دارشتنی ئەیامبی سێ پێیی[١١] یان مەسنەوی لاواندنەوە[١٢]. یان هەرجۆرە کێشێکی تری لەم بابەتە. دەتوانین بڵێین خەڵکی شیعر بەو

کێشە دەبەستنەوە کەپێی نووسراوە، بۆ نموونە، بە هەندێکیان دەڵێن شاعیری لاواندنەوەو بەهەندێکی تر دەڵێن شاعیری داستانی. کەپێیان دەڵێن شاعیر، لەبەر ئەوە نییە کەلاسایی دەکەنەوە، بەڵکو بەبێ جیاوازی، لەبەرئەوەیە کەکێش بەکار دێنن، چونکە وا باوە تەنانەت ئەوانەی بەرهەمی پزیشکی و زانستیش بەشیعر دەنووسن هەر پێیان دەگوترێ شاعیر. لەگەڵ ئەوەشدا هۆمیرۆس[١٣] و ئەمپیدۆکلیس[١٤]، جگە لەکێش[١٥] هیچ شتێ بەیەکەوە کۆیان ناکاتەوە. هەر بۆیە، لەکاتێکا دروستە بەهۆمیرۆس بگوترێ شاعیر، چاکتر وایە بەئەمپیدیۆکلیس بگوترێ فەیلەسووف، نەك شاعیر.

بەهەمان شێوە، ئەگەر دانەرێ لاساکردنەوەکەی بەتێکەڵ کردنی کێشەکان بنووسێ، وەکوو کیریمۆن[١٦] لەنووسینی (کەنتۆرس)[١٧] وەکەیدا کەراپسپۆدییەکەو[١٨] ئەم چەشنە کێشە تێکەڵاوەی تێدا بەکارهاتووە. دەبێ ئەویش هەر پێی بگوترێ شاعیر[١٩]. ئەمانەن ئەو جیاوازییانەی من لەم بارەوە دەیانبینم.

لەلایەکی تریشەوە، هەندێ هونەرمەند هەن، ئەو هەموو وەسیلانە بەکاردێنن کەباسم کردن، واتە: ئیقاعو مۆسیقاو کێش. وەکوو شیعری نۆمۆس[٢٠] و دیترامبوس، تراجیدی و کۆمیدی. ئەمانە جیاوازییان لەوەدایە کەدووەکەی پێشەوە ئەم هەموو وەسیلانە بەسەر یەکەوە بەکار دێنن، کەچی دووەکی دواوە، بەجیا جیا بەکاریان دێنن[٢١].

کەواتە من مەبەستم لەجیاوازی وەسیلەی لاساکردنەوەی هونەرەکان ئەوەیە کەگوتم.

## بەشی دووەم

# بابەتەکانی لاساییکردنەوەی شیعریی

لەبەرئەوەی هونەرمەندە لاساییکەرەوەکان، لەحاڵەتی کردەوەدا [١] لاسایی مرۆڤ دەکەنەوەو مرۆڤیش چار نییە یان باشە، یان خراپە[٢] (لەبەرئەوەی خەڵك بەگوێرەی رادەی چاکە، یان خراپە یان، رەوشت و ئاکاریان دەگۆڕێ، ئیتر کەسێتیيان دەکەوێتە بەر یەکێ لەم دوو جۆرە)، بۆیە دەبێ ئەم مرۆڤانە یان بەشێوەیەکی لەئێمە چاکتر بنوێنرێن، یان بەشێوەیەکی خراپتر و یان وەکوو ئێمە مانان خۆمان.

بەم جۆرە، لەنیگارکێشەکان (پۆلیگنۆتس) [٣] بابەتەکانی بەجۆرێکی چاکتر دەنواندو (پۆسۆن)[٤] بەجۆرێکی خراپتر، کەچی (دیۆنیسیوس)[٥] بابەتەکان چۆن بوون دەق وەکوو خۆیان وێنەی دەکێشان.

ئاشکرایە هەریەکە لەجۆرەکانی لاساکردنەوە کەئامارژەم پێدان، ئەم جیاوازییەیان تێدا دەردەکەوێ و بەگوێرەی ئەو بابەتانەی لاسایان دەکەنەوە، لەیەك جیا دەبنەوە. ئەم جیاوازییە دەشێ لەسەماو مۆسیقای نای و چەنگیشدا هەبێ، لەو هونەرەشدا کەزمان بەکاردێنێ، چ پەخشان بێ و چ شیعر، بەلام بەبێ مۆسیقا. بۆنموونە (هۆمیرۆس) وێنەی کەسەکانی لەواقیعی خۆیان باشتر دەکێشاو (کلیۆفۆن) [٦] بەشێوەی ئاسایی خۆیان وێنەی دەکێشان، کەچی (هیگیمۆن)[٧] ی تاسۆسی کەیەکەم نووسەری (پارۆدی) [٨] یەو (نیکۆکاریس)[٩] کە (دێیلاد)[١٠] ی

داناوه، کەسەکانیان لەواقیع پەست و نزمتر پیشان دەدەن. ئەم جیاوازییە لەشیعری دیترامبی‌و نۆمۆسیشدا هەیە. بۆنموونە (تیموتیوس)[11] و (فیلۆکسینوس)[12]، بەشێوەی جیاجیا (کیکلۆپوس)[13]یان نواندووە. هەر ئەم جیاوازییەشە کەکۆمیدی‌و تراجیدی لەیەک دادەبڕێنێ. کۆمیدی هەوڵ دەدا خەڵك لەواقیعی خۆیان خراپتر بنوێنێ. کەچی تراجیدی هەوڵ دەدا چاکتر بیانوێنێ[14].

## بەشی سێیەم

# شێوازی لاساکردنەوەی شیعریی

جیاوازییەکی تریش، کەسێیەمین جیاوازییە، لەنێوان ئەم هونەرانەدا هەیە. ئەویش شێوازی لاساکردنەوەی هەر جۆرە بابەتێکە. بۆنموونە دەشێ هەمان وەسیلە بۆ سالاکردنەوەی هەمان بابەت بەکاربێنێ، بەڵام بەشێوەی جیاجیا. بۆی هەیە هەندێکی بەگێڕانەوە بکاو هەندێکی لەسەر زمانی کەسانی تر بێ. وەکوو هۆمیروس[1] وای دەکردو. یان لەوانەیە بەزمانی خۆیەوە قسە بکا بێئەوەی ئەم جۆرە گۆڕانانەی تێدا بکا، یان بەجۆرێ لاسای کەسەکان بکاتەوە کەبەشێوەی درامی[2] هەموو کارو کردەوەکان پێشکەش بکەن.

کەواتە هەروەکوو لەسەرەتاوە باسم کرد، ئەمانە ئەوسێ هۆکارەن کەدەبن بەمایەی لەیەك جیابوونەوەی هونەرەکانی لاسایی کردنەوە: ئەو وەسیلەی بەکاری دێنن، یان ئەو بابەتەی لاسای دەکەنەوە و یان ئەو شێوازەی لەلاساکردنەوەدا پەیرەوی دەکەن.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین (سۆفۆکلیس)[3] لەرووبەکەوە وەکو (هۆمیروس) لاسای شت دەکاتەوە. چونکە هەردووکیان لاسای مرۆڤی چاك دەکەنەوە، کەچی لەڕوویەکیتر وەکوو (ئەرەستۆفانیس)[4] لاسای شت دەکاتەوە، چونکە هەردووکیان لاسای مرۆڤی وا دەکەنەوە کەلەحاڵەتی ئیشکردنی راستەقینەدان.

هەندێ دەڵێن ئەمانە بۆیە بەبەرهەمەکانیان دەگوترێ دراما[٥]، چونکە لەحاڵەتی کارکردندا لاسای مرۆڤ دەکەنەوە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە (دۆری)[٦] یەکان تراجیدی و کۆمیدی، هەردووکیان، بەداهێنانی خۆیان دادەنێن، کەچی (میگاری)[٧] یەکان کۆمیدی بەداهێنانی خۆیان دەزانن، چ ئەوانەی لێرە، لەیۆنانن، چونکە کۆمیدی ئەو کاتە سەری هەڵداوە کەئەوان فەرمانڕەواییەکی دیموکراسییان[٨]، گێڕاوە، چ ئەوانەی لە(سەقلیە)ن، چونکە (ئێپیکارموس)[٩]ی شاعیر کەزۆر پێش (کیونیدس)[١٠] و (ماگینس)[١١] بووە، خەڵکی ئەوێ بووە. هەندێ لە(دۆری)یەکانی (پیلۆپۆنیس)[١٢]یش تراجیدی بەهی خۆیان دەزانن، ئەوان ناوەکەیان دەکەن بەبەڵگەی بۆچوونەکەیان، دەڵێن:

ئاتینیەکان بەگوندە نزیکە شارەکان دەڵێن (دیمۆی)، کەچی ئەوان خۆیان وشەی (کۆمای)یان بۆ بەکاردێنن. هەروەها دەڵێن:

کۆمیدینووسەکان ناوی خۆیان لە(کۆمازێن)[١٣] وەرنەگرتووە کەمانای (بەزمو رابواردن) دەدات، بەڵکو وشەکە لە(کۆمێ)هاتووە کەمانای گەڕانو سووڕانە، چونکە ئەمانە لەبەر بێ ڕێزی شار بەدەر کرابوون. جگە لەمەش، ئەو وشەیەی ئەوان بۆ (کارکردن) بەکاری دێنن، بریتییە لە(دران)[١٤] کەچی ئاتینیەکان وشەی (پراتێین)ی بۆ بەکار دێنن[١٥].

ئەمەیە ژمارەو سیمای جۆرە جیاجیاکانی لاسایی کردنەوە.

# بەشی چوارەم

## بنچینەو گەشەسەندنی شیعر

سەرهەڵدانی شیعر بەگشتی بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە، هەردووکیان ڕەگیان لەسروشتی مرۆڤ داکوتاوە[1]. مرۆڤ هەر لەمنداڵییەوە خدووی لاساکردنەوەی بەمیرات بۆ ماوەتەوە. جیاوازی نێوان مرۆڤو گیانلەبەرانی دی ئەوەیە: مرۆڤ لەهەموو گیانلەبەرەکانی دی لاساییکەرەوەترو یەکەم زانیاری خۆی بەلاساییکردنەوە فێر دەبێو هەمووومان لەناخەوە حەز لەلاساییکردنەوە دەکەینو چێژی لێ وەردەگرین[2]. بەڵگەی ئەمەش لەتاقیکردنەوەو پەیڕەوکاری ڕاستەقینەدا دەست دەکەوێ. ئەوشتانەی ئازاردەرن، ئەگەر بێتو بەوردی لاساییان بکرێتەوە، چێژو خۆشی لەبینینیان وەردەگرین، وەکوو ئەدگاری گیانلەبەرە نزمەکانو کەلاکی مردووەکان.

ئەمەش هۆی ئەوەیە کەفێربوون چێژێکی زۆری تێدایە[3]؛ نەک هەر تەنیا بۆ فەیلەسووفەکان، بەڵکو بۆ خەڵکی تریش بەگشتی ، هەرچەندە ئەوان توانای فێربوونیان تاڕادەیەك کەمە[4]. ئەوان چێژ لەبینینی شتی لەیەکچوو وەردەگرن، چونکە کەلێی وردەبنەوە زۆر زانیاری لێ فێر دەبنو دەری دەخەن، هەریەکە لاسای چی دەکاتەوەو ئاشکرای دەکەن کەبۆ نموونە (ئەمە فلان، یان فیسارە)[5]. سەبارەت بەهەرچی هەبێ: ئەو شتەی وێنەی کێشراوە ئەگەر پێشتر بەرچاو نەکەوتبێ، لەو حاڵەتەدا

چـێژو خۆشـــییەکە لەلاســـاکردنەوەی شـــتەکەدا نییـــە، بـــەڵکو لەجێبەجێکردن و ڕەنگ کردن و هەر هۆیەکی تری وا دایە[٦].

کەواتە خدووی لاساکردنەوە شتێکە لەسروشتی خۆماندایە، هەستی ئیقـاع [٧] و مۆسـیقاش هەروایـە – تەنانـەت کێـشیش کـەخۆی بەشـێکە لـەئیقاع. مـرۆڤ سـەرەتا لـەم توانـا سروشـتییەوە دەسـتی پێکـردووەو بەزنجیرەیەك هەوڵی سەرەتایی پێشکەوتندا تێپەڕیوەو بەسەر پێیـی شتی گوتووەو لەم سەرپێییەدا شیعر پەیدا بووە[٨].

شـیعر، هـەر زوو بـەگوێرەی میزاجـی کەسـێتی شـاعیرەکانەوە، دوو لقـی لێ بۆتـەوە: ئەوانـەی بـەرزو سـەنگین بـوون کەوتنـە لاسـاکردنەوەی کـردەوەی بـەرزو کـاری کەسـانی جـوامێرو گـەڕناس، کەچـی ئەوانـەی پەسـت و نـزم بـوون لـەبارەی کەسـانی نـزمتری ئـەم ژیانـەیان نووسـی. بەم چەشنە، جۆرێکیان ویردی ئایینی‌و پیاهەڵدانیان[٩] نووسـی و ئەوانەی تـر دەستیان بەنووسینی توانج و داشۆڕین کرد.

ئێمـــە نـــەمانزانزیوە پـــێش(هـــۆمیروس) هـــیچ شـــاعیرێك شـــیعری داشـۆڕینی هـەبووبێ، هەرچـەندە زۆر لەگوێنـە زۆر شـاعیر هـەبووبن ئـەم جـۆرە شـیعرەیان نووسـیبێ، بـەڵام لـە (هـۆمیروس) بـەم لاوە نموونـەمان دەست دەکەوێ. هەروەکوو شیعری (مارگیتس)[١٠] کە (هۆمیروس) خۆی نووسیویەتی و شیعری تری واش. ئەم جۆرە شیعرانە بەکێشی (ئەیامبی) نووسـراون، چـونکە کێشەکە لەگەڵ مەبەستەکە دەگونجێ و تـا ئـەمڕۆش هەر پێی دەگوترێ (ئەیامبی) [١١]، چونکە ئەوان (ئەیامب)، یان (داشۆڕین) یـان بـەم کێـشە لـەدژی یـەکتر نووسـیوە. ئـیتر وا کەوتـەوە کـە هەنـدێ لەشاعیرانی زوومان بوون بەنووسەری پاڵەوانێتی و هەندێکی تر بوون بە نووسەری شیعری ئەیامبی. ( هۆمیروس) شاعیرێکی هەرە بەرز بوو نەك

سەبارەت بە شێوازی پتەوو بێ وێنەی لەدارشتنی ئەدەبیدا، بەڵکو سەبارەت بەسیمای درامی [12] لاسای کردنەوەکانیشی. یەکەم کەسیش بوو کەبنەما سەرەکییەکانی کۆمیدی، بەتاووتووکردنی شتی پێکەنیناوی بەشێوەی درامی نەك بەنووسینی داشۆرینی کەسێتی، بۆ ئێمەمانان پوخت کردۆتەوە. بۆیە پەیوەندی (مارگیتس) ەکەی بەکۆمێدی وەکوو پەیوەندی (ئیلیادە)[13] و (ئۆدیسە) [14] وایە بەتراجیدی، بەڵام کاتێ کەتراجیدی و کۆمیدی سەریان هەڵدا، هەریەکە لەدوو کۆمەڵە شاعیرەکە کەوتە پەیرەوکردنی ئەوەی لەگەڵ سروشتی تایبەتی خۆی یەك دەگرێتەوە. واتە هەندێ شاعیری داشۆرین بوون بەشاعیری کۆمیدی، کەچی هەندێ شاعیری تر کەوتنە سەر نووسینی تراجیدی [15]، چونکە ئەم شێوە تازانە، هەردووکیان، لەوانەی پێشوو مەزنترو بەرزتر بوون [16].

لێرەدا، ئیشی من نییە لەوە بکۆڵمەوە داخۆ ئێستا هەموو شێوە جیاجیاکانی تراجیدی بەپێی توانا پێشکەوتووە، یان نا؟ یاخود لەوە بکۆڵمەوە ئایا دەبێ هەڵسەنگاندنی تراجیدی، دەقەکەی خۆی چۆنە، بەو پێیە بکرێ؟ یان بەپێی لاساکردنەوەی لەسەر شانۆ[17]؟

تراجیدی و کۆمیدی، هەردووکیان لەسەرەتاوە بەسەر پێی دەستیان پێکردووە. یەکێکیان لەگەڵ پێشەنگانی (دیترامب) سەری هەڵداوەو ئەوەی‌تر لەگەڵ پێشەنگانی سترانی (فالی) [18] پەیدابووە کەتا ئەمڕۆش لەزۆر لەشاکارەکاندا وەکوو بابەتێکی دێرین هەر ماوە. تراجیدی بەهەنگاوی شێنەیی بەرەو پێش دەچوو، هەر ڕەگەزێکی تازە کەدەهاتە ناوەوە، پەرەی دەسەندو هەندێ گۆڕانی بەسەردا دەهات، بەمەوە شێوەی سروشتی خۆی وەرگرت و لەقالبی خۆی مەیی [19].

(ئەسخیلوس) [20] یەکەم کەس بوو لەباتی یەك [21] ئەکتەر، دوو ئەکتەری بەکارهێناو بایەخی کۆرسی کەم کردەوەو پایەی یەکەمی بەگفتوگۆ (دیالۆگ) بەخشی. کەچی (سۆفۆکلیس) ژمارەی ئەکتەرەکانی گەیاندە سێ و نەخش و نیگاری بۆ شانۆ زیاد کرد [22].

ئینجا ئەوکاتە هات کەتراجیدی درێژکرایەوەو بەکارهێنانی کورتە چێن خرایە لاوەو چنینە باسکراوەکە درێژتر کرایەوە. لەهەمان کاتیشدا، ئەو زمانە گاڵتاوییەی یەکێ بوو لەسیمای شێوەی ساتیری [23] زوو، نەماو شێوازی تۆکمەی تراجیدی جێگای گرتەوە. لە(تروکی [24] چوارپێیی [25] گۆڕاو بوو بە(ئەیامپی) [25] شاعیرەکان، یەکەم جار، چوار پێیان بەکاردەهێنا، چونکە شیعری ساتیرییان دەنووسی کەزۆر لەسەماوە نزیك بوو، بەڵام کەگفتوگۆ (دیالۆگ) هاتە ناوەوە، بەسروشتی خۆی، کێشی گونجاوی خۆی دۆزییەوە، چونکە کێشی ئەیامبی لەهەمووکێشەکان زیاتر لەگەڵ قسەکردندا دەگونجێ، ئەمەش زۆ چاك لەو ڕاستییەدا دەردەکەوێ کەئێمە لەگفتوگۆی نێوان خۆماندا بەزۆری ئەیامبی بەکاردێنین، کەچی بەدەگمەن وادەبێ بەشەش پێیی بدوێین، ئەویش تەنیا ئەوکاتە دەبێ کە لەگفتوگۆو قسەی ئاسایی دوور دەکەوینەوە. گۆڕانێکیتر بریتی بوو لەزیادکردنی ژمارەی هەندێ ئەپیسود، یان دیمەنی شانۆیی. لێرەدا پێویستە بەسەر بابەتی تری وەکوو ڕازاندنەوەی جۆراوجۆری تراجیدی و ئەو بارودۆخەی تراجیدی تیا هاتۆتە کایەوە تێبپەڕین، چونکە ئەگەر بەدووروودرێژی بچینە ناویانەوە، لەوانەیە ئیشەکەمان ببێ بەکارێکی درێژخایەن.

# بەشی پێنجەم

## سەرهەڵدانی کۆمیدی،
## بەراوردی داستان و تراجیدی

هەروەکوو باسمان کرد[1] کۆمیدی بەشێوەیەکی خراپتر لەواقیع لاسای مرۆڤ دەکاتەوە، بەلام خراپتر بەو مانایە نا کەهەموو جۆرە خراپییەک و هەرچی خراپییەکی هەبێ، بەڵکو بەو مانایەی کەگاڵتەجاڕی جۆرێکە لەدزێوی و خراپی[2]، چونکە گاڵتەجاڕیی لەهەندێ شێوەی چەوتی و دزێوی پێک دێ کەئازار، یان زیانیان تێدا نییە[3]. بۆ نموونە، رووبەندی[4] کۆمیدی شێواوو دزێوە بەلام نابێ بەمایەی هیچ ئازارێک[5].

ئێمە ئێستا شتێ لەبارەی قۆناغە یەک لەدوای یەکەکانی پێشکەوتنی تراجیدیو ئەوانەی دەوریان لەم قۆناغانەدا هەبووە، دەزانین، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا سەرەتای مێژووی کۆمیدی تەمارییە، چونکە کۆمیدی بەجیددی وەرنەگیراوە. ماوەیەکی زۆری پێچوو ئەوسا (ئەرکۆن)[6] رێگەی دا کۆرس لەکۆمێدی بەکاربێ. تا ئەو کاتە، پێشکەشکەرەکان بەپێی داخوازی خۆیان، بەشدارییان دەکرد (٧). تا ناوی هەندێ شاعیری کۆمێدی پەیدا بوو، کۆمیدی چەند شێوەیەکی دیارو تایبەتی خۆی وەرگرتبوو.

ئەوەش دیار نییە داخۆ کێ رووبەند، یان بەربێژ(٨)، یان فرە ئەکتەریی و شتی لەم بابەتەی پێشکەش کردووە.

دارشتنی چنینی چاك لەبنچینەدا بۆ (ئیێکارمۆس) و (فۆرمیس) ⁹ دەگەڕێتەوە کەسەقلیەیی بوون. لەشاعیرانی ئاتین (کرێتیس) [10] یەکەم کەس بوو داشۆرینی ئایە لاوەو چیرۆك‌و چنینی گشتیی بەکارهێنا.

شیعری داستانی لەوەدا لەگەڵ تراجیدی یەك دەگرێتەوە کەبەشیعری تۆکمەو پتەو لاسای کارو کردەوەی بەرز دەکاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، داستان‌و تراجیدی لەوەدا لەیەك جیا دەبنەوە کەداستان تەنیا یەك تاکە کێش بەکاردێنێ‌و لەشێوەی گێڕانەوەدایە.

جیاوازییەکی تر لەدرێژیدایە: تراجیدی هەوڵ دەدا بەپێی توانا ماوەکەی لەیەك سووڕی ڕۆژدابێ، یان ئەختێ زیاتر[11]، کەچی داستان خۆی بەهیچ سنوورێکی کات نابەستێتەوە، ئەگەرچی یەکەم جار تراجیدیش لەم ڕووەوە وەکوو داستان وابووە.

لەبارەی بەشە پێکهێنەرەکانەوە، هەندێکیان لەهەردوو جۆرەکەدا هەن‌و هەندێکیان تایبەتن بەتراجیدی.

بەم جۆرە، هەرکەسێ بتوانێ لایەنی چاکەو لایەنی خراپە لەتراجیدی لەیەك جیابکاتەوە، دەتوانێ لەداستانیشدا ئەم جیاوازییە پێشان بدا. چونکە هەموو ڕەگەزەکانی داستان لەتراجیدیدا هەن، بەڵام وانییە هەموو ڕەگەزەکانی تراجیدی لەداستاندا هەبن[12].

# بەشی شەشەم

## باسێکی تراجیدی

پاشان دێمەوە سەر باسی ئەو جۆرە لاساکردنەوەی کەکێشی شەش پێیی تێدا بەکاردێ‌و دێمەوە سەر باسی کۆمیدیش[1]، بەڵام ئێستا دەمەوێ باسی تراجیدی بکەم. یەکەم جار با بەیەکەوە پێناسەی سروشتی‌و بنچینەیی تراجیدی لەو شتانەوە هەڵێنجین کەتائێستا گوتراون.

تراجیدی [2] لاساکردنەوەی کردەوەیەکی [3] سەنگین و [4] لەخۆیەود تەواو [5] پێگەیشتووە کەدرێژییەکی دیاری هەیە [6]و بەزمانێکی [7] پاراو نووسراوە کەچەندین بابەتی هونەری تێدا هاتووە کەلەگەڵ بەشەکانی شانۆگەریدا دەگونجێن‌و ئەمەش هەمووی بەشێوەی درامی [8] نەک بەگێڕانەوە ئەنجام دەدرێ‌و ڕووداوی وای تێدایە کە (بەزەیی) و (ترس) دەوروژێنێ‌و بەمەوەش (پاکبوونەوە) [9] لەم دوو سۆزە دێتە دی.

لێرەدا، مەبەستم لە(زمانێکی پاراو)، ئەو زمانەیە کەئیقاع و مۆسیقاو گۆرانی تێدابێ‌و مەبەستم لە(لەگەڵ بەشەکانی شانۆگەریدا دەگونجێن) ئەوەیە کەهەندێکیان تەنیا بەهۆی شیعرەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ‌و هەندێکیتر بەهاوکاری گۆرانی [10].

لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی لاساکردنەوەکە ئەنجام دەدەن، بەکردەوە کارەکەیان پێشکەش دەکەن، دیمەنەکە دەبێ بە پلە، یەک بێ کەبەشێکی

بنچینەییە لەتراجیدی دا[١١]. دوای ئەمە ئینجا گۆرانی و دارشتن بەپلە دوو دێن کەئەمانەش وەسیلەی لاساکردنەوەن. لێرەدا، مەبەستم لە (دارشتن) ڕێکخستن و هۆنینەوەی شیعرەکەیە. (گۆرانی)ش زاراوەیەک هەموو کەس دەزانێ مانای چییەو پێویست بەڕوون کردنەوە ناکات.

تراجیدی لاسایی کردنەوەی کردەوەیەو کردەوەش چەند کەسێکی دەوێ بۆئەوەی جێبەجێی بکەن و ئەو کەسانەش بێگومان هەندێ سیمای تایبەتیان لەهزرو کەسێتیدا هەیە، هەر ئەم دوو ڕەگەزەشن کە جۆری کردەوەکە دیاری دەکەن. ئەمە وامان لێ دەکا بڵێین هۆی ئەم کردەوانە دووشتە: هزرو کەسێتیو ئەم دوو هۆیەش دەبن بەمایەی سەرکەوتن، یان تێشکانی هەرکەسێ. کەواتە لاسایی کردنەوەی کردەوە بریتییە لە(چنین)ی تراجیدی و لێرەدا مەبەستم لە(چنین) ڕێکخستنی ڕووداوو شتەکانە. لەلایەکی تریشەوە مەبەستم لە(کەسێتی) ئەو خەسیەت و سیمایانەیە کەدەدرێنە پاڵ ئەو کەسانەی کردەوەکە جێبەجێ دەکەن و کەسەکانیش هەر بەو خەسیەت و سیمایانە دەناسرێنەوە. مەبەستیشم لە(هزر) ئەوەیە کەلەقسەی کەسەکانەوە دەردەکەوێ کاتێ کەبیانەوێ شتێ بسەلمێنن، یان رایەك دەربڕن[١٢].

هەر تراجیدییەك لەشەش ڕەگەز پێك دێ کەخەسیەت و بەهای تراجیدییەکە دیاری دەکەن. ڕەگەزەکانیش ئەمانەن:

چنین[١٣]، کەسێتی[١٤]، دارشتن[١٥]، هزر[١٦]، دیمەن[١٧]، گۆرانی[١٨].

لەم ڕەگەزانە، دوویان وەسیلەی پێشکەش کردنی کردەوەن، ڕەگەزێکیش بریتییە لەشێوازی لاساکردنەوەکە، کەچی سێ ڕەگەزەکەی

تر پەیوەندییان بەبابەتی لاسایی کردنەوەی دراماکەوە هەیە. تراجیدی لەمانە زیاتر پێویستی بەهیچ شتی تر نییە.

دەتوانین بڵێین: هەموو شانۆگەرینووسەکان ئەم رەگەزە درامییانەیان بەکردەوە پەیڕەو کردووە، چونکە هەموو شانۆگەرییەك، بەبێ جیاوازی ئەمانەی تێدایە: دیمەن، کەسێتی، چنین، دارشتن، گۆرانی ، هزر.

لەهەموو رەگەزەکان گرنگتر چنینە، واتە رێکخستنی رووداوەکانە، چونکە بێگومان تراجیدیا لاسایی‌کردنەوەی کەسەکان نییە، بەڵکو لاسایی کردنەوەی کردەوەو ژیانو بەختەوەری‌و بەدبەختییە – بەختەوەری و بەدبەختی مرۆڤیش بەکردەوە بەسراوەتەوە. مەبەست لە (ژیان) ئەنجامدانی جۆرە کردەوەیەکی دیاریکراوە نەك خەسیەتێك. کەسەکان، بەو خەسیەتەی هەیانە، کەسێتیان دەردەکەوێ، بەڵام بەختەوەری‌و بەدبەختییان بەهۆی کردەوەکانیان دێتە دی، کەواتە تراجیدی بۆئەوە پێشکەش ناکرێ لاسای کەسێتی بکاتەوە، بەڵکو کەسێتی لەپێناوی کردەوەکەدا بەگەڕ دەخرێ. بەم جۆرە مەبەست لەتراجیدی ئامانجێکە خۆی لەچنین‌و رووداودا دەدۆزێتەوەو گرنگترین لایەنی هەر شتێکیش ئامانجەکەیەتی.

جگە لەمەش، تراجیدی بەبێ کردەوە نابێ، بەڵام بەبێ کەسێتی دەبێ.

لەراستیدا، زۆربەی شانۆگەرینووسەکانی ئەم دواییەمان ناتوانن لاسای کەسێتی بکەنەوە. دەشێ لەبارەی شانۆگەرینووسەکانی سەردەمەکانی تریش هەمان قسە بکەین. دەتوانین ئەم جیاوازییە لەنێوان (زیوکسیس) [19] و (پۆلیگنۆتس) دیاری بکەین، وەکوو دوو نیگارکێش.

(پۆلیگنۆتس) زۆر چاك لاسای کەسێتی دەکردەوە، کەچی (زیوکسیس) لەنیگارەکانیدا بایەخی بەم لایەنە نەدەدا.

دیسان ئەگەر یەکێ زنجیرە گوتارێك بنووسێ کەکەسێتی دەربڕێ و گوتارەکان هزرو دارشتنیان باش بێ هێشتا هەر لەوانەیە کاریگەریی دروستی تراجیدییان نەبێ، کەچی لەوانەیە تراجیدییەك لەڕووی هزرو دارشتنەوە ئەوەندە سەرکەوتوو نەبێ بەڵام چنینێکی پتەوی هەبێ و رووداوەکانی توند بەیەکەوە بەسرابن، ئەوسا کاریگەرییەکی زیاتری دەبێ. جگە لەمە خاڵێکی تریش هەیە دەبێ تێبینی بکەین ئەویش ئەوەیە کەدوو رەگەزی هەرە گرنگی تراجیدی لەڕووی کاریگەری دەروونییەوە بریتین لە (وەرچەرخان) و (ناسینەوە) (٢٠). ئەم دووە لەپێکهاتەکانی چنینن.

بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە ناشییەکان لەسەرەتاوە دەتوانن لەدارشتنی چاك و وێنەکێشانی کەسێتی سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەر لەوەی بتوانن چنینی چاك لەڕووداوەکان دروست بکەن. دەتوانین هەمان قسە لەبارەی نزیکەی هەر هەموو شاعیرە تراجیدیدینووسەکانی زوو بکەین.

کەواتە چنین یەکەم بنچینەی درامایە، یان بڵێین خوێنی ژیانی درامایە، ئینجا کەسێتی بە پلە دوو دێت. مەسەلەکە لەنیگارکێشانیشدا تا رادەیەکی زۆر هەمان شتە، چونکە ئەگەر هونەرمەندێك جوانترین رەنگ بەشپرزەیی لەسەر تابلۆکەی بڵاوبکاتەوە، ئەو چێژە نابەخشێ کە وێنەیەکی چاك بەڕەنگی رەش [٢١] و سپی بکێشێ. بەم جۆرە، تراجیدی لەبنچینەدا بریتییە لەلاسایی کردنەوەی کردەوەیەك و کە لاسای کەسێتییەکیش دەکاتەوە هەر سەبارەت بەوەیە کەلەبنچینەدا لاسای کردەوەیەك دەکاتەوە

رەگەزی سێیەمی تراجیدی (هزر) ە. مەبەستم لەمە، توانای گوتنی ئەو شتەیە کە دەشێ بگوترێ، یان ئەوەیە لەهەل‌و مەرجی لەباردا قسەی گونجاو بکرێ. ئەم رەگەزەی تراجیدی پەیوەندی بەهونەرەکانی زانستی سیاسەت‌و رەوانبێژییەوە هەیە. شاعیرە درامییە کۆنەکان وایان دەکرد کەسەکانیان بەزمانی سیاسییەکان بدوێن، کەچی شاعیرەکانی ئەمڕۆ وادەکەن کەسەکانیان بەزمانی رەوانبێژەکان [٢٢] بدوێن، کەسێتی مرۆڤ ئەوەیە کەشتێ ڕوون نەبێ‌و ئەم چی وەریدەگرێ، یان ڕەتی دەکاتەوە، بتوانێ روونی بکاتەوە، بۆیە کەسێتی لەوقسانەدا دەرناکەوێ کە قسەکەرەکە نەتوانێ هیچی پەسەند بکا، یان هیچی لێ رەت بکاتەوە ، جا هەرچییەکی هەبێ، لەلایەکی‌تریشەوە (هزر) لەو قسانەدا دەردەکەوێ کەبۆ سەلماندنی راستی، یان ناراستی شتێ، یاخود بۆ دەربڕینی بیروڕایەکی گشتی دەگوترێن.

چوارەم شت داڕشتنی قسەیە. مەبەستم لە (داڕشتن)دا، هەروەکوو پێشتر ڕوونم کردەوە بەکارهێنانی وشەیە بۆ دەربڕینی بیروڕای کەسەکان. ئەمە لەشیعرو لەپەخشاندا هەمان هێزو کاریگەری هەیە.

لەو رەگەزانەی ماون، گۆرانی [٢٣] چێژ بەخشترین خەمڵ‌و زێوەرە لە تراجیدیدا. ئینجا دیمەنی شانۆیی، یان کاریگەریی سەر دەپێ شانۆ، هەرچەندە سەرنجکێشانێکی تایبەتی بەخۆیەوە هەیە، بەڵام پەیوەندی بەپیشەی شانۆگەرینووسین‌و بەهونەری شیعرەوە لەهەموویان کەمترە، چونکە هێزو کاریگەری تراجیدی لەئەکتەرەکان‌و لەپێشکەش کردنی تراجیدییەکە جیایە. جگە لەمەش ، بەرپاکردنی کاریگەری شانۆیی زیاتر پەیوەندی بەو کەسانەوە هەیە کە شانۆگەرییەکە دەردێنن، تا شاعیری تراجیدی.

# بەشی حەفتەم

## بواری چنین

ئێستا، دوای تەواوکردنی ئەم پێناسەیە، پێویستە بێمە سەر لێکۆڵینەوەی ڕێکخستنی ڕووداوەکان، چونکە ئەمە لەتراجیدیدا لەهەموو شتێکی دی گرنگترە. پێشتر باسم کرد کەتراجیدی بریتییە لە(لاساکردنەوەی کردەوەیەکی سەنگین و لەخۆیەوە تەواو و پێگەیشتوو کەدرێژییەکی دیاری هەیە..) دەشێ شتێ تەواوبێ بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا درێژییەکی وای نەبێ. شتی تەواو ئەوەیە کە(سەرەتا)و (ناوەڕاست)و (کۆتایی) هەبێ. (سەرەتا) ئەوەیە لەدوای شتێ‌ترەوە نایە، بەڵام شتێ‌تری بەدوادادێ. (کۆتایی)، بەپێچەوانەوە، ئەوەیە بەسروشتی خۆیەوە بەدوای شتێ‌تردا دێ، چ بەناچاری بێ و چ بەشیاوی‌بێ،[1] بەڵام خۆی هیچ شتێ‌تری بەدوادا نایەت. (ناوەڕاست) ئەوەیە لەدوای شتێکی‌ترەوە دێ و شتێکی تریشی بەدوادا دێ. چنینی چاک نابێ سەرەتاو کۆتایی هەرچۆنی ڕێک کەوت بەو جۆرەبێ، بەڵکو دەبێ لەگەڵ ئەو بنەمایانە بگونجێ کەباسم کردن.

جگەلەمە، شتی جوان، چ بوونەوەرێکی زیندووبێ و چ ماددەیەک بێ و لەچەند بەشێک پێک هاتبێ، پێویستە نەک هەر ڕێکخستنی بەشەکانی

ڕێك و پێك بێ، بەڵكو دەبێ قەبارەیەكی گونجاویشی هەبێ. چونكە جوانی پەیوەستە بەڕێكخستن و بەقەبارەیەكی تایبەتییەوە. بوونەوەری هەرە بچووك ناشێ جوان بێ، چونكە بینینەكەی كاتێكی وای ناوێ و ناتوانین بەڕوونی دەركی پێبكەین، هەروەها شتی هەرە زلیش، وەكوو شتێ كە بۆنموونە هەزار میل درێژبێ، چونكە چاو ناتوانێ هەمووی بەیەك جار وەربگرێ، ئیتر تەماشاكەر هەست بەیەكێتی و تەواوییەكەی ناكات.

بەم جۆرە، چۆن بوونەوەری زیندوو، یان ئەو پێكهاتەیەی لەچەند بەشێك دروست بووە، دەبێ قەبارەیەكی دیاری هەبێ بۆئەوەی چاو بەیەك سەرنج وەری بگرێ، هەر بەم شێوەیەش پێویستە چنین درێژییەكی دیاری هەبێ بۆئەوەی زەین بەئاسانی وەری بگرێ[٢]. دیاریكردنی درێژی چنین كەتاڕادەیەك پەیوەندی بەپێشكەش كردنی سەر شانۆوە هەیە، هیچ پەیوەندی بەهونەری دراممیەوە نییە.

ئەگەر سەد تراجیدی لەپێشبڕكێی تراجیدیدا پێشكەش بكرانایە دەبوایە بەكاتژمێری ئاوی كاتەكەیان دیاری بكرێ. دەڵێن شتی وا لە زەمانی كۆن دەكرا[٣]، بەڵام، بەهەرحاڵ. سروشتی دراما ڕادەیەكی تایبەتی دەسەپێنێ ئەویش ئەوەیە كەتاچیرۆكەكە درێژتر بێ، جوانتر دەبێ، بەو مەرجەی زۆر روون بێ و شیاوی تێگەیشتن بێ. بۆئەوەی پێناسەیەكی گونجاو پێشكەش بكەین دەتوانین بڵێین ڕادەی درێژی دروست و پێویستی چنین ئەوەیە كەدرێژییەكەی بەجۆرێ بێ ماوەی گۆڕانی تێدا هەبێ لەكلۆڵییەوە بۆ بەختەوەری و لەبەختەوەرییەوە بۆ كلۆڵی.

# بەشی هەشتەم

## یەکێتی چنین

یەکێتی چنین، وەکوو هەندێ کەس بۆی دەچن، لەوەدا نییە کەبابەتەکەی لەبارەی یەک کەسەوە بێ. لەوانەیە یەک تاکە کەس زۆر شت. یان بەبێ پەی و سنوور شتی لێ بقەومێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شتانە هیچ جۆرە یەکێتییەک دروست ناکەن. بەهەمان چەشنیش، بۆی یەک تاکەکەس زۆر کردەوە ئەنجام بدا، بەڵام ئەو کردەوانە هیچ تاکە کردەوەیەکی یەکگرتوویان لێ بەرهەم نەیە. بۆیە دیارە ئەو شاعیرانەی (هیراکلیاد)[١]، یان (تسیوسیاد)[٢]، یان هۆنراوەی تری لەم بابەتەیان نووسیوە، بەهەڵەدا چوونە. ئەوان وایان زانیوە مادام (هیراکل) یەک تاکە کەس بووە، کەواتە چیرۆکەکەشی دەبێ یەکێتی تێدابێ. ئاشکرایە هۆمیروس، کەلەهەموو شتێکا بێهاوتابوو، چ بەهونەر بێ و چ بەسەلیقە، لەم مەسەلەیەدا شارەزابووە. کە (ئۆدیسە)ی نووسوە، هەرچی بەسەر (ئۆدیسوس) هاتووە هەمووی تێدا باس نەکردووە. بۆنموونە، ئەوەی کە (ئۆدیسە) لەچیای (پرناس)[٣] دا بریندار بووە[٤] یان ئەوەی لەکاتی چەک هەڵگرتندا خۆی شێت کردووە[٥]، چونکە ئەم دوو ڕووداوە بەهۆی ناچاری، یان شیانەوە، یەک بەهۆی ئەوەی ترەوە پەیدا نەبووە. بەپێچەوانەوە (هۆمیروس) یەک کردەوەی لەو کردەوانە هەڵبژاردووە کەباسم کردو کردوویەتی بەبابەتی (ئۆدیسە). لە(ئیلیادە)شدا هەر وای کردووە. بەم جۆرە، چۆن

لەهونەرەکانی‌تری لاسایی‌کردنەوەدا، هەر تاکە لاسایی کردنەوەیەك یەك تاکە بابەتی هەیە: چنینی شانۆگەریش دەق بەم جۆرە وایە، لاسای یەك تاکە کردەوە دەکاتەوە کەدەبێ وەکوو شتێکی تەواوو یەکگرتوو پێشکەشی بکاو دەبێ ڕووداوە جیاجیاکانی بەجۆرێکی وا پتەو بەیەکەوە ببەسرێنەوە کەئەگەر یەکێ لەو ڕووداوانە لەشوێنی دروستی خۆیەوە دانەنرێ، یان ئەگەر فڕێ بدرێ. کردەوە تەواوو پێگەیشتووەکە تووشی شێوان و لێك ترازان دەبێ. چونکە هەر شتێ ئەگەر هەبوون و نەبوونی وەکوو یەك وابێ و هیچ جیاوازییەك دروست نەکا: دیارە لەو (کردەوە تەواوو پێگەیشتووە)دا، شتێکی نۆرگانی و ڕاستەقینە نییە.

# بەشی نۆیەم

## ڕاستەقینەی شیعری و ڕاستەقینەی مێژوویی

ـ:

لـەوەی باسمـان کـرد: بەئاشـکرا دەردەکـەوێ کەئـەرکی شـاعیر ئەوەنییە باسی ئەو شتە بکا کەبەڕاستی ڕووی داوە، بەڵکو ئەرکی ئەوەیە باسی ئەو شتە بکا کەدەشێ ڕووبدا: ئەویش بۆیە دەشێ ڕووبدا چونکە ڕووداوەکەی لەهەل ومەرجێکی تایبەتیدا: یان شتێکی شیاوە. یان شتێکی پێویستە. جیاوازی نێوان مێژوونووس و شاعیر ئەوە نییە کەیەکێکیان بەپەخشان دەنووسـێ و ئـەوەی تـر بەشـیعر[1]. لەوانـەبوو بەرهەمەکـەی (هیرۆدۆتـس) بەشـیعر بنووسـرایە. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا چ بـەکێش بنووسرایەو چ بێ کێش. هەر مێژوو بوو. جیاوازییەکە لەوەدایە یەکێ باسی شتێ دەکا کەڕووی داوەو ئەوەیتر باسی شتێ دەکا کەلەوانەیە ڕووبدا. هەر لەبەر ئەمەشە شیعر لەمێژوو فەلسەفیترو بەهادارترە: چونکە شیعر بایەخ بەڕاستەقینەی هاماو گشتی دەدا. کەچی مێژوو مامەڵە لەگەڵ ڕاستەقینەی تایبەتی دەکا[2]. مەبەستم لە(ڕاستەقینەی هاماو گشتی) ئەو شتەیە کەلەوانەیە. یان پێویستە. جۆرە کەسێکی تایبەتی لەهەلوێستێکی دیاریکراودا بیڵێ. یان بیکەن. هەر ئەمەشە ئامانجی شیعر. تەنانەت کەناوی هەندێ لەتاکە کەسەکانیش دێنێ[4]. کەچی ڕاستەقینەی تایبەتیی مێژوویی ئەوەیە کەبا بڵێین (ئەلکیبیادس)[5] کردوویەتی. یان بەسەری هاتووە.

ئەم جیاکردنەوەیە لەکۆمیدیدا روون و ئاشکرایە، چونکە شاعیری کۆمیدی یەکەم جار چنینەکە لەڕووداوی گونجاو دروست دەکا ئینجا هەر ناوێکی بیەوێ لەخۆیەوە بۆی زیاد دەکا. شاعیری کۆمیدی وەکو شاعیری ئەیامبی -- داشۆرین -- نییە کەلەبارەی کەسانی راستەقینەوە دەنووسێ، ئەوانەی کەبەناو ناسراون.

لەلایەکیترەوە، لەتراجیدیدا، نووسەرەکان هەمیشە ناوی کەسانی راستەقینە بەکاردێنن، هۆیەکەشی ئەوەیە ئەو شتەی بشێ روو بدا، بڕوای پێدەکرێ، بەڵام شتێ رووی نەدابێ ناتوانین دڵنیابین کەئەو شتە دەشێ رووبدات. ئاشکرایە، ئەوەی رووی‌دابێ دەشێ ڕووبدا، چونکە ئەگەر وانەبوایە، رووی نەدەدا.

لەگەڵ ئەمەشدا، لەهەندێ تراجیدیدا، تەنیا یەک دوو ناو باش ناسراون، ئەوانەی تر هەموو خەیاڵین. هەندێ تراجیدی‌تر هەر هیچ ناوی ناسراویان تێدا نییە وەکوو (ئەنتوییس)ی (ئاگاتۆن)[٦] کەهەموو رووداوو ناوەکانی خەیاڵی‌و دەستکردن. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەمە لەچێژی شانۆگەری کەم ناکاتەوە. کەواتە، پێویست ناکا شاعیر بەتەواوی خۆی بەچیرۆکی دێرین ببەستێتەوە -- کەدەکرێتە بابەتی تراجیدی. لەڕاستیدا، ئەم جۆرە کارە چەشنێکە لەبێهوودەیی، چونکە تەنانەت چیرۆکی باویش تەنیا لای خەڵکێکی کەم، باوو ناسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو کەس تام و چێژی لێ وەردەگرێ[٧].

لەوەی کەگوتم ئاشکرا دەردەکەوێ کەشاعیر یەکەم جار دروستکەری چنینە. ئینجا هۆنەرەوەی شیعرە، چونکە خۆی بەهۆی لاساکردنەوەیە کەدەبێ بەشاعیر. ئەوەی لاساییشی دەکاتەوە کردەوەکەیە. تەنانەت ئەگەر شاعیر مامەڵە لەگەڵ ڕووداوی ڕاستەقینەش بکا هەر شاعیرە، چونکە هیچ

ەربەست لەوەدا نییە هەندێ لەو شتانەی بەڕاستی روویان داوە، ەتەواوی بەبەر یاسای شیانو گونجان بکەون. ئیتر کەلەبارەی ئەم شتانەوە دەنووسێ، دەبێ بەشاعیر.

خراپترین چنینو کردەوە (ئەپسۆدی)[8]یە. مەبەستم لەچنینی (ئەپسۆدی) ئەوەیانە کەبێ رەچاوکردنی یاسای (شیان)و (ناچاری)، زنجیرەی دیمەنەکانی بەدوای یەکدا دێن. ئەوانەی ئەم جۆرە شانۆگەرییە ەنووسن شاعیرە خراپەکانن. کەناتوانن نەینووسن –، شاعیرە چاکەکانیش بۆ خاتری ئەکتەرەکان ئەم شتە دەکەن. ئەمانە کەبەمەبەستی پێشبڕکێی[9] درامی کارەکانیان دەنووسن، بەزۆری چنینەکە لەسنووری توانای خۆی، زیاتر لەیەك دەکێشنەوە. ئیتر زنجیرەی بەردەوام بوونی رووداوەکان، بەناچاری ئالۆزی تێدەکەوێ. لەگەڵ ئەمەشدا، تراجیدی هەر تەنیا لاسایی‌کردنەوەی یەك تاکە کردەوەی تەواو نییەو بەس، بەڵکو لاسای رووداوی وا دەکاتەوە کە(ترس)و (بەزەیی) دەرووژێنێ.

ئەم جۆرە رووداوە ئەگەر بێتو کتوپڕو بێ‌چاوەڕوانی رووبداتو رووداوەکانیش لۆجیکی بن، واتە لەئەنجامی یەکترەوە بێن، لەبارەی وروژاندنی ترسو بەزەیی، کاریگەری بەهێزتری دەبێ، چونکە ئەوسا سەرنجکێشتر دەبێ لەوەی کەهەر تەنیا بەڕێکەوتو سەرەڕۆ رووبدات. رووداوی رێکەوتو سەرەڕۆش ئەگەر بەجۆرێ رووبدا وەك ئەوەی پێشتر نەخشەی بۆ کێشرابێ، سەرنجکێشتر دەبێ، بۆنموونە وەکوو پەیکەری (میتویس) لە(ئارگۆس)[10] کەلەناهەنگێکی گشتیدا بەسەر ئەو پیاوەدا بەربووەوەو کوشتی کەکاتی خۆی ببوو بەهۆی مەرگی (میتویس). ئەم جۆرە رووداوە واناکەوێتە بەرچاو کەهەر بەرێکەوت رووی‌دابێ. جا ئەگەر چنینێك بەم جۆرە داڕژابێ، چار نییە لەوانی‌دی باشتر دەبێ.

## بەشی دەیەم

# چنینی سادەو چنینی داڕژاو

هەنـدێ چـنین سـادەن [1] و هەنـدێکیان داڕژاون. هـۆی ئەمـەش ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە ، ئەو کردەوەی چنینەکە لاسای دەکاتەوە، یان سادەیەو یان داڕژاوە. مەبەستم لەکردەوەی سادە ئەوەیە کەکردەوەکە تاکو بەردەوام بێ بەو مانایەی پێشتر باسم کرد، لەهەمان کاتدا بەبێ (وەرچەرخان) و (ناسینەوە) چارەنووسی پاڵەوانەکەی تێدا بگۆڕێ [2].
کردەوەی داڕژاویش [3] ئەوەیە کەگۆڕانەکە، یان (ناسینەوە)ی لەگەڵدابێ، و یان (وەرچەرخان)و یان هەردووکیان.

ئەمانەش (واتە: وەرچەرخانو ناسینەوە) دەبێ لەبنیاتی چنینەکە خۆیەوە گەلاڵە بێنو دەبێ ئەنجامی ناچاریی یان شیاوی رووداوی پێشەوە بن، چونکە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەوەی لەئەنجامی شتێکی پێشەوە روودەدات لەگەڵ ئەوەی هەر تەنیا ئاوا بەدوای شتی پێش خۆیدا دێ [4].

# بەشی یازدەم

## وەرچەرخان و ناسینەوەو کارەسات

هەروەکوو ئاماژەمان بۆکرد (وەرچەرخان) [1] گۆڕانە لەبارێکەوە بۆ بارێکی پێچەوانە، کەوەکوو پێشتر گوتم لەگەڵ دەستووری شیان، یان ناچاریدا بگونجێ. بۆ نموونە لە(ئۆدیبوس)دا، ئەو تەتەرەی هات بۆ ئەوەی خۆشی بخاتە دڵی ئۆدیبوس و ئەو ترسەی لا بڕەوێنێتەوە کەبەرامبەر بەدایکی هەیبوو، کاتێ ئۆدیبوسی لەبارەی لەدایکبوونی ئاگادار کردەوە، کارێکی تەواو پێچەوانەی لێ کرد. هەروەها لەشانۆگەری (لۆنکیوس)[2]دا، لۆنکیوس بەرەو مەرگ دەبەن، لەوکاتەدا (داناوس) شوێنی دەکەوێ بۆئەوەی بیکوژێ، بەڵام لەئەنجامی ڕووداوەکانی پێشەوە وادەکەوێتەوە کە(داناوس) دەکوژرێ، کەچی (لۆنکیوس) ڕزگار دەبێ.

(ناسینەوە) [3]، هەروەکوو لەناوەکەیەوە دیارە، گۆڕانێکە لەنەزانینەوە بۆ زانین و دەبێ بەهۆی خۆشەویستی[4]، یان ڕق لەنێوان ئەو کەسانەی چاکە، یان خراپەیان لەچارە نووسراوە. کاریگەرترین جۆری (ناسینەوە) ئەوەیە کە (وەرچەرخان) ی لەگەڵدابێ، وەکوو لەتراجیدی (ئۆدیبوس)دا هاتووە. بێگومان جۆریتری ناسینەوەش هەن، لەوانەیە لەبارەی شتی بێگیان و بابەتی بێ نرخ بن. جگە لەمە، دەشێ ناسینەوەو دۆزینەوە ئەوەش بگرێتەوە، داخۆ یەکێ فلانە ئیشی کردووە، یان نا؟ بەڵام گرنگترین جۆری (ناسینەوە) کەپەیوەندی ڕاستەوخۆی بەچنین و

بەکردەوەی شانۆگەرییەوە هەبێ. ئەو جۆرەیە کەباسمان کرد چونکە ئەم جۆرە (ناسینەوە)یە کە(وەرچەرخان)یشی لەگەڵدایە، (بەزەیی) یان (ترس) دەبزوێنێ. بەپێی پێناسەکەی خۆیشم هەر تراجیدییە، کەلاسای ئەم جۆرە کردەوانە دەکاتەوە کەدەبن بەمایەی وروژاندنی (بەزەیی) یان (ترس)

جگە لەمەش: ئەو (ناسینەوە)ی (وەرچەرخان) ی لەگەڵدابێ بۆی هەیە ببێ بەهۆی کۆتاییەکی خۆش، یان کۆتاییەکی ناخۆش.

کەواتە: لەبەرئەوەی (ناسینەوە) لەنێوان کەسەکان دەبێ. بۆی هەیە تەنیا یەکێ یەکێکیتر بناسێتەوەو ئەوەی دووەمیان ناسراوبێ. یان بۆی هەیە هەردوو کەسەکە یەکتر بناسنەوە، بۆنموونە وەکوو (ئۆریستیس بەناردنی نامەیەك (ئیفجینیا) [٥] دەناسێتەوە، بەلاّم لێرەدا هەرنەبوو ناسینەوە)یەکی تریش هەبێ، کە (ئیفیجینیا) (ئۆریستیس) بناسێتەوە

کەواتە لەم جۆرە رووداوانەدا، دوو رەگەزی چنین هەن کە(وەرچەرخان) (ناسینەوە)ن. رەگەزێکی تری سێیەمیش هەیە کەپاتۆسە [٦]، واتە بەلاّو کارەساتە.

لەم سییانە، پێناسەی (وەرچەرخان)و (ناسینەوە) کراوە، ماوەتەوە سەر پاتۆس کەدەتوانین ئەویش بەوە پێناسە بکەین کەکارێکی بەسروشت تێکدەرو زیانبەخش و لەناوبەرە وەکوو مردن و ئەشکەنجەی سەختو برینداریو شتی وا کەبخرێنە بەرچاو.

# بەشی دوانزەم

## بەشە سەرەکییەکانی تراجیدی

پێشتر باسی ئەو ڕەگەزە جۆراوجۆرانەمان کرد کەتراجیدی پێک دێنن، ئێستاش باسی بەشە سەرەکییەکان، یان سەربەخۆکان دەکەین کەتراجیدیان بەسەردا دابەش دەبێ‌و بەم جۆرەی خوارەوەن:

بەربێژ (پرۆلۆگ)، دیمەنی شانۆیی (ئەپیسۆد) [١]، دەرچوون (ئەگزۆدس) گۆرانی کۆرس، ئەمەیان بەدەوری خۆیەوە دابەشی دوو جۆر دەکرێ:

تێپەڕین (پارۆدس) [٢]و جێگرتن (ستاسیمۆن) [٣]. ئەمانە لەهەموو تراجیدییەکدا هەن، لەگەڵ ئەمەشدا، گۆرانی ئەکتەرەکان‌و لاواندنەوە (کۆموس) تەنیا لەهەندێ تراجیدیدا هەن.

بەربێژ (پرۆلۆگ) [٤] سەرجەمی ئەو بەشەی تراجیدییە، کەپێش هاتنە ژوورەوەی کۆرس (تێپەڕین – پارۆدس) دێ.

دیمەنی شانۆیی (ئەپیسۆد) [٥] سەرجەمی ئەو بەشەی تراجیدییە کەدەکەوێتە نێوان دوو گۆرانی تەواوی کۆرس.

دەرچوون (ئەگزۆدس)[٦] سەرجەمی ئەو بەشەی تراجیدییە، کەهیچ گۆرانی کۆرسی بەدوادا نایە.

تێپەڕین (پارۆدس) سەرجەمی گۆرانی یەکەمی کۆرسە.

جێگرتن (ستاسیمۆن) گۆرانییەکە کۆرس بەکۆمەڵ پێشکەشی دەکا.

نەبەکێشی (ئەناپێست)[7] و نەبەکێشی (تروکی)[8]یە.

لاواندنەوە (کۆموس) لاواندنەوەیەکە کۆرس و ئەکتەرەکان بەیەکەوە پێشکەشی دەکەن.

بەم جۆرە، تراجیدی دابەشی سەر ئەم بەشە جیاجیاو سەربەخۆیانە دەبێ. پێشتریش باسی ئەو رەگەزانەم کرد کەتراجیدی پێك دێنن.

## بەشی سێزدەم

# کردەوەی تراجیدی

دوا بەدوای ئەو شتانەی باسم کردن، لەسەر ئەوە دەڕۆم و باسی دەکەم، شاعیر دەبێ ئامانجی لەدارشتنی چنیندا چی بێ و دەبێ خۆی لەچ دورر بخاتەوەو سەرچاوەی کاریگەری تراجیدی لەچییەوە دێ ؟

هەروەکوو بینیمان، تراجیدی هەرە تەواو ئەوەیە چنینەکەی دارژاوبێ، نەك سادەو دەبێ لاسای کردەوەی وا بکاتەوە کەترس و بەزەیی بروروژێنێ، چونکە ئەرکی تایبەتی ئەم جۆرە تراجیدییە لەمەدایە. دوای ئەمە، بەپلەیەك ئەوەدێ کە ئەو گۆڕانەی بەسەر پیاوی چاکدا دێ نابێ ئەوەبێ لەخۆشگوزەرانییەوە بکەوێتە کلۆلی، چونکە ئەمە ترس و بەزەییمان تێدا نارووژێنێ، هەر ئەوەندەیە هەستمان بریندار دەکا و بێزمان لێ دەبێتەوە. هەروەکوو نابێ پیاوی خراپ وا پێشان بدرێ لەکلۆلییەوە بگاتە خۆشگوزەرانی. ئەم جۆرە چنینە لەهەموو شتێ ناتراجیدیترە، چونکە هیچ پێویستییەکی تراجیدی نییەو هەستی مرۆڤایەتیی گشتیمان بەرامبەر ئەوانەی تر، ئەمە قبوول ناکا، ترس و بەزدیشمان تێدا نارووژێنێ.

دیسان ئەوەش نابێ کەدیمەنی کابرایەکی تەواو خراپ و بێکەلك وایپیشان بدرێ لەخۆشگوزەرانییەوە بکەوێتە کلۆڵی [1]، چونکە هەرچەندە ئەم جۆرە چنینە سۆزی مرۆڤایەتیمان بەرامبەر ئەوانەی تر دەبزوێنێ، بەڵام نەبەزەیی دەوروژێنێ و نەترس، چونکە بەزەییمان بەوە دەورووژێ کەیەکێ تووشی بەدبەختیو چارەڕەشییەك بێ شایەنی خۆی نەبێ، ترسیشمان بەوە دەورووژێ کەیەکێکی کت و مت وەکوو خۆمان تووشی مەترسی ببێ – بەزەیی بەرامبەر لێقەوماوێکی ناموستەحەق و ترس لەمەلۆێستی یەکێکی وەکوو خۆمان – ئەم جۆرە گۆڕانە هیچ شتێکی وا لەمەلۆێستەکە بەرپا ناکا کەترس و بەزەیی بروروژێنێ.

دەمێنێتەوە سەر ئەو پاڵەوانەی دەکەوێتە نێوان ئەم دوو جەمسەرە، واتە ئەوەی ئەو جۆرە کەسەی چاکەو دادپەروەری لەوپەڕیدا نییەو تووشی کلۆڵی دەبێ، نەك سەبارەت بەخراپەو گەندەڵی، بەڵکو سەبارەت بەهەڵەیەك کە کردوویەتی، یان کەموکورتییەك (هارماتیا)[2] کەتیایەتی. پێویستە کابرایەك لەخۆشگوزەرانی دابێ و ناوبانگێکی بەرزی هەبێ وەکوو (ئۆدیبوس)و (تێیستیس)و کەسانی تری ناوداری سەر بەبنەماڵەی وەکوو بنەماڵەی ئەمانە.

کەواتە دەبێ ئەوە بزانین کەچنینی چاك پێویستە بابەتەکەی یەك تاکە شت بێ، نەك دوولانە[3] بێ، وەکوو هەندێ کەس بۆیدەچن، و دەبێ گۆڕانی چارەنووسی پاڵەوانەکەی لەخۆشگوزەرانییەوە بێ بۆ کلۆڵی. نەك بەپێچەوانەوە، لەکلۆڵییەوە بۆ خۆشگوزەرانی. هەروەها گۆڕانەکە نابێ لەئەنجامی خراپەو بەدکارییەوە بێ، بەڵکو دەبێ بەهۆی هەڵەیەك، یان کەموکورتییەکەوە بێ، بەمەرجێ لەیەکێکی وادا بێ وەك ئەوەی کەباسم

کرد. یان لەو چاکتر بن، نەک خراپتر. راستی قسەکەشم لەو تاقیکردنەوەیەدا دەردەکەوێ کەشانۆ پێشکەشیان دەکا.

جاران شاعیرەکان هەر چیرۆکێکیان بکەوتایە بەردەست مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، بەڵام ئێستا باشترین تراجیدی بەزۆری ئەوەیە کەلەبارەی کەسێکی سەر بەیەکێ لەچەند بنەماڵەی وەکوو بنەماڵەی ئەلکمایۆن[4] و ئۆدیبوس و ئۆریستیس[5] و میلیاگەر[6] و تیێستیس[7] و تیلیفوس[8] و هیتر دەنووسرێ، ئەوانەی کاری ترسنکاکیان ئەنجام داوە، یان پێیەوە تلاونەتەوە.

کەواتە، باشترین تراجیدی ئەوەیە ئاوها بەپێی دەستووری هونەری دابڕژێ. ئەو رەخنەگرانە بەهەڵەداچوونە کەرەخنە لەیۆریپیدیس[9] دەگرن، چونکە لەتراجیدییەکانیدا ئەم جۆرە کارەی ئەنجام داوەو گازاندە دەکەن کە کۆتایی زۆربەی تراجیدییەکان بەبەدبەختی و کلۆڵی دێنێ، کەچی ئەمە، وەکوو گوتم، کۆتاییەکی راست و دروستە. باشترین بەڵگەشمان ئەوەیە کەلەسەر شانۆ لەشانۆی پێشبڕکێی درامیدا هاتووە. ئەمانە ئەگەر چنینەکەیان بەچاکی و تۆکمەیی دابڕێژرێ، لەهەمووی تراجیدیتر دەبن. یۆریپیدیس ئەگەرچی زۆر دەسەڵاتی بەسەر بنیاتی چنیندا نییە، بەڵام لەرووی تراجیدییەوە بەگەورەترین شاعیری درامی دادەنرێ.

دوای ئەمە، باشترین جۆری بنیات، کەهەندێ رەخنەگر بەپلە یەکیان داناوە، ئەوەیە کە، وەکوو ئۆدیسە، دوو چنینی تێدابێ. ئەم جۆریان دوو کۆتایی دژو پێچەوانەی هەیە: یەکێ بۆکەسێتی چاک و ئەوەی تریان بۆ کەسێتی خراپ. ئەگەر ئەم جۆرە چنینە پەسەند بێ، ئەمە بۆ نزمی حوکمدانی جەماوەر دەگەڕێتەوە، چونکە ئەوسا، شاعیر بەپێی ئارەزووی

جەماوەر شت دەنووسن. بەڵام ئەم تام و چێژە لەگەڵ تراجیدی ناکونجێن، زیاتر سەر بەکۆمیدییە. لەکۆمیدیدا، ئەوانەی لەچیرۆکە راستەقینەکەدا دوژمنی سەرسەختی یەکترن، بۆ نموونە وەکوو ئۆریستیس[10] و ئیگیستوس، لەکۆتاییدا دەبن بەبرادەرو کەس کەس ناکوژێ.

# بەشی چواردەم

## ترس و بەزەیی

ترس و بەزەیی بۆی هەیە بەهۆی دیمەنی شانۆییەوە بروورژێنرێن، بۆیشی هەیە لەناخی بنیاتی کردەوەوە سەرهەڵبدەن، ئەمەیان ڕێبازێکی پەسەندەو نیشانەی شاعیری تراجیدی هەرە چاکە. چنینەکە دەبێ بەجۆرێکی وا ڕێك بخرێ، کەئەوەی هەر بیبیسێ، بێ ئەوەی بشیبینێ لەسەر شانۆ پێشان بدرێ، لەبەر ترس و بەزەیی موچرکی پێدابێ، ئەمە وەکوو ئەوە وایە هەر کەسێ گوێی لەچیرۆکی ئۆدیپوس بێ هەستی پێ دەکا. بەڵام خولقاندنی ئەم جۆرە هەستە هەر تەنیا بەهۆی دیمەنی شانۆییەوە، دوورە لەبابەتی هونەری ڕاستەقینەوە، چونکە ئەو حەڵە کاریگەرییەکە پشت بە هاوکاریی دەرهێنەر [1] دەبەستێ. بەڵام ئەوانەی دەیانەوێ بەهۆی بەکارخستنی دیمەنی شانۆییەوە، نەك ترس بەڵکو تەنیا هەستی دزێوو تۆقێنەر بروورژێنن، ئەمانە هیچ پەیوەندیان بەتراجیدییەوە نییە، چونکە تراجیدی ئەوە نییە هەموو تام و چێژێکی لێ داوا بکەین، بەڵکو تەنیا ئەو تام و چێژەی لێ داوا دەکەین کەتایبەتە بەخۆیەوە. لەبەرئەوەی شاعیر لەسەریەتی بەهۆی لاساکردنەوە چێژی تراجیدی لەترس و بەزەیی بەرهەم بێنێ، دیارە دەبێ ئەم کاریگەرە بخاتە ناو ڕووداوەکانی چنینی دراماکەوە[2].

ئێستا با باسی ئەو جۆرە ڕووداوانە بکەین کەویژدانمان دەهەژێنن و یان ترس و یان بەزەییمان تیا دەبزوێنن. ئەو ڕوداوەی بۆ ئەم باسە لەبارێ، واتە بەسروشت بتوانێ ئەم جۆرە کاریگەرە بەرپا بکات، دەبێ لەو کەسانە بقەومێ کە: یان دۆست بن و یان دوژمن، و یان نەدۆست بن و نەدوژمن.

ئەگەر کابرایەك دوژمنەکەی خۆی بکوژێ، یان هەوڵی کوشتنی بدا، ئەمە هیچ شتی بەزەییبزوێنی تێدا نیە تەنیا ئەوە نەبێ ئەگەر ئەشکەنجەکە، یان ئازارەکە، خۆی لەخۆیەوە بەزەییبزوێن بێ. بەهەمان شێوە بەحاڵی ئەو کەسانەش کە ئەدۆستن و ئەدوژمن، مەسەلەکە هەمان شتە. بەڵام ئەگەر رووداوە تراجیدیاکە بەسەر کەسانی وا دابێ کەلەخوێن خزمی یەکتر بن، وەکوو ئەوەی بۆ نموونە، برایەك برای خۆی بکوژێ، یان کوڕێك باوکی خۆی بکوژێ، یان دایکێك کوڕی خۆی بکوژێ، یان کوڕێك دایکی خۆی بکوژێ، یان هەر جۆرە کارێکی لەم بابەتە. ئەم جۆرە رووداوانە شایەنی ئەوەن شاعیری تراجیدی بەدوایاندا بگەڕێ. جگە لەمەش ئەم جۆرە شاعیرە هەق نییە هێڵە سەرەکییەکانی چیرۆکی کۆن بگۆڕێ. بۆنموونە وەکوو ئەوەی ئەو راستیە بگۆڕێ کە (ئۆرێستیس)، (کلیتمنسترا)[3] ی کوشتووە، یان (ئەلکمایۆن) (ئاریفیل)[4]کوشتووە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش شاعیر ماوەی ئەوەی دراوە کەخەیاڵی خۆی بخاتە کارو بەشێوەیەکی کاریگەر مامەڵە لەگەڵ ئەم چیرۆکە کۆنانە بکات. یان بەشێوەیەکی روونتر باس بکەین مەبەستمان لە (شێوەیەکی کاریگەر) چییە.

یان لەوانەیە ئەوەی کارەکە دەکا، بەهۆشیارییەوە کارە تۆقێنەرەکەی ئەنجام بدات و ئەو کەسانە بەتەواوی بناسێ کەرووداوەکەیان بەسەر دێ، وەکوو لەبەرهەمی شاعیرە تراجیدییەکانی زەمانی کۆن وا بووە، بۆ نموونە یۆرپیدیس وادەکا کە (میدیا) منداڵەکانی خۆی بکوژێ.

یان لەوانەیە ئەوەی کارەکە دەکا کارە تۆقێنەرەکەی ئەنجام بدات بەڵام نەزانێ خۆی چ پەیوەندییەکی بەو کەسانەوە هەیە کەرووداوەکەیان بەسەر دێ، پاشان راستەقینەی ئەو پەیوەندییەی بۆ دەردەکەوێ، وەکوو ئەوەی (سۆفۆکلیس) لەبارەی (ئۆدیبوس) کردوویەتی. لە(ئۆدیبوس)دا،

رووداوە تۆقێنەرەکە دەکەوێتە دەرەوەی دەقی شانۆکەرییەکە، بەلام نموونەی تر هەن رووداوەکە لەناو دەقی شانۆگەرییەکە خۆی رووددا، وەکوو ئەوەی لەو تراجیدییەی (ئەستیداماس)[٦] نووسیویەتی. لە(ئەلکمایون) قەوماوە، یان وەکوو ئەوەی لەشانۆگەری (ئۆدیسەی بریندار)دا، بەسەر (تێلیگۆنوس)[٧] هاتووە.

جۆری سێیەمیش هەیە. ئەویش ئەوەیە ئەوەی کارەکە دەکا، لەبەر نەزانیو نەناسینی کەسەکان، خەریك بێ کارێکی کوشندە ئەنجام بدا بەلام کەپەیوەندییە راستەقینەکەی بۆ دەردەکەوێ لەگەڵ کەسەکان. دەست لەکارەکە هەڵدەگرێ.

هەر تەنیا ئەوەندە لایەنە رێی تێ دەچێو بەس، چونکە رووداوەکە، یان دەقەومێ و یان ناقەومێ، ئەمەش، یان بەناسینی کەسەکان دەبێو یان بەبێ ناسینیان.

لەم ئیحتیمالانە، هەرە خراپەکەیان ئەوەیە کەیەکێ ئاگاداری راستییەکە بێ، واتە کەسەکان بناسێو خەریك بێ کارەکەی خۆی ئەنجام بدا، بەلام نەتوانێ ئەنجامی بدا. ئەمە تەنیا ئەوەندەیە دەمانتاسێنێو لەبەر ئەوەی هیچ کارەساتی بەدەمەوە نییە، بەتراجیدی دانانرێ. لێرەدا، هیچ کەسێ، مەگەر بەدەگمەن، ئەگەر نا رێگای نەدراوە بەم جۆرە هەڵسوکەوت بکا وەکوو ئەوەی کاتێ لە (ئەنتیگۆنە)[٨] دا (هایمۆن) ناتوانێ (کریمۆن) بکوژێ. لەبارەی پلەی کاریگەرییەوە، دوای ئەمەیان، ئەوە دێ کەکارەکە هەر بەراستی جێبەجێ دەکرێ، لێرەدا وا باشترە ئەوەی کارەکە دەکات بەنەزانی بیکات، واتە نەزانی ئەوەی رووداوەکەی بەسەر دێ کێیە. تەنیا پاشان راستییەکەی بۆ دەربکەوێ، چونکە ئەمە

هیچ شتی وای تێدا نییە بێزو نەفرەت ببزوێنێ و ناسینەوەکەش تووشی تاسانمان دەکات.

باشترین ڕێباز ئەوەی دواوەیە. بۆنموونە وەکوو لە (کریسفۆنتیس)[9] دا، (مێرۆپێ) دەیەوێ کوڕەکەی خۆی بکوژێ، بەڵام دەیناسێتەوە ئیتر نایکوژێ. یان وەکوو ئەوەی لەشانۆگەری (ئیفجینیا لەتۆریس)[10] دا خوشك‌و براکە هەمان شتیان بەسەردێ (لەوکاتە ناسکەدا، خوشکەکە برای دەناسێتەوە)، یان وەکوو ئەوەی لە (هێللێ)[11]دا، کوڕەکە کاتێ کەخەریکە دایکی خۆی لەخشتە ببا، دایکی دەیناسێتەوە.

هەر لەبەر ئەمەشە – وەکوو پێشتر باسم کرد – هەموو تراجیدییەکان لەبارەی ئەم چەند بنەماڵە کەمەوەن، چونکە شاعیرەکان، کەبەدوای کەرەستەی درامیدا گەڕاون، بەڕێکەوت نەك بەشارەزای هونەری، زانیویانە چۆن کاریگەری تراجیدی لەچنینەکانیاندا بەرجەستە بکەن. شاعیرەکان ئێستاش ناچارن هەر بگەڕێنەوە سەر ئەو بنەماڵانەی تووشی کارەساتی گەورە هاتوون کەباسم کرد.

ئەوەندەی تا ئێستا باسم کرد لەبارەی ڕێکخستنی ڕووداوەکانی تراجیدی‌و ئەو جۆرە چنینەی دەبێ لەتراجیدییەکەدا هەبێ، بۆ ئێرە بەسە.

# بەشی پازدەم

## سیماکانی تراجیدی

لەسیماکانی کەسێتی تراجیدی ئەوەیە: شاعیر دەبێ ئامانجی چوار شت بێ. یەکەمینیان و هەرە گرنگەکەیان ئەوەیە کەسێتییەکە دەبێ چاک بێ. وەکوو لەپێشەوە باسم کرد کەسێتی ئەوکاتە دەردەکەوێ کەبەقسە، یان بەکردەوە، شتێکی پەسندی خۆی دەربڕێ، ئەگەر پەسندکردنەکە شتی چاك بگرێتەوە. دیارە کەسێتییەکە چاکە. لەوانەیە چاکە لەهەموو جۆرە کەسێکدا هەبێ، بۆنموونە، بۆی هەیە ژن و تەنانەت کۆیلەش چاك بن، هەرچەندە لەوانەیە کەژن پایەی لەپیاو نزمتر بێ و کۆیلەش بەگشتی هەر هیچ نەبێ.

بەپلە دوو، وێنەی کەسێتییەکە دەبێ لەبارو گونجاو بێ. بۆنموونە، بۆی هەیە کەسێتییەك سیفاتی پیاوانەی تێدابێ، بەڵام شتێکی گونجاو نییە کەسێتییەکی ژن سیفاتی پیاوانە، یان زیرەکی بدرێتە پاڵ.

سێیەم، کەسێتییەکە دەبێ لەگەڵ واقیعدا یەك بگرێتەوە. ئەمەش لەوە جیایە کەپێشتر لەبارەی دروستیو گونجانەوە باسم کرد.

چوارەم، کەسێتی دەبێ چەسپاو بێو بەدرێژایی شانۆگەرییەکە لەگەڵ خۆیدا کۆك بێ، تەنانەت ئەو کەسەی لاسای دەکرێتەوە ئەگەر ناکۆکیش بێ لەگەڵ خۆیا و ئەمە لەشانۆگەرییکەدا سیفەتێکی خۆی بێ، دیسان دەبێ تاکۆتایی هەر بەناکۆکی بمێنێتەوە لەگەڵ خۆیدا.

نموونەیەك بۆ خراپەیەكی ناپێویستی كەسێتی وەكوو (مینلاوس) لە(ئۆرێستیێس)دا. نموونەیەكی ئەو كەسێتییەی هەڵسوكەوتی ناجۆرو نەگونجاو بێ وەكوو شینو شەپۆری (ئۆدیسوس) لەشانۆگەری (سكیللا)[1]دا، یان وەكوو گوتارەكەی (میلانیپی)[2]. كەسێتی ناكۆك لە(ئیفجینیا لەتۆریس) داهاتووە، چونكە ئیفجینیا كەیەكەم جار دەپارێتەوە، ئەمە تەواو لەهەڵسوكەوتی پاشتری جیایە.

شاعیر لەپێشاندانی كەسێتیدا، پێویستە وەكوو مەسەلەی رێكخستنی رووداوەكان، هەمیشە شتی پێویستو شتی شیاوی لەمێشكدا بێ. واتە دەبێ شتێكی پێویست، یان شتێكی شیاو بێ. كەكەسێكی واو وا، شتێكی واو وا بڵێ، یان بكا. هەر بەو جۆرەش، هەر رووداوێك كەلەدوای رووداوێكی ترەوە دێ. دەبێ بەم چەشنەبێ، واتە دەبێ بەگوێرەی پێوستی، یان شیاوی هاتبێ. جگە لەمەش، ئاشكرایە دەبێ كردنەوەی چنینەكە لەناخی بارودۆخی چنینەكە خۆیەوە سەرهەڵبداو نابێ پشت بەهێزێكی ئەودیو سروشت ببەستێ (وەكوو بەكارخستنی هێزی خواكان)، هەر وەكوو لەشانۆگەری (میدیا)و لە(ئێپیسۆد)ی گەڕانەوەی یۆنانیەكان بەسواری كەشتی[3] لە(ئیلیادە)دا هاتووە.

پێویستە هێزی خواكان تەنیا بۆ ئەو مەسەلانە بخرێنە كار كەلەدەرەوەی شانۆگەرییەكە خۆی دان، یان بۆ ئەو شتانەی پێش شانۆگەرییەكە روویان داوەو لەتوانای مرۆڤدا نییە دەركیان بكا، یان بۆ ئەو شتانەی هێشتا روویان نەداوە و پێویستیان بە پێشبینییە - چونكە ئەو تواناو دەسەڵاتە هەر لەخواكاندا دەبینێن كەهەموو شتێ دەزانن - هەروەها نابێ ئەوەی روودەدا هیچ شتێكی وای تێدابێ لێكدانەوە

هەڵنـدگریّ، خـۆ ئەگـەر شـتی وا هەشـبیّ، دەبـیّ بکەویّتـە دەرەوەی تراجیدییەکە، هەروەکوو لە(ئۆدیبوس)ی (سۆفۆکلیس)دا هاتووە.

لەبەرئـەوەی تراجیـدی بریتییـە لەلاسـاکردنەوەی کەسـانی وا کەلـەڕادەی ناوەنـدی بـەرزترن، دەبـیّ پـەیڕەوی نیگارکێـشی کارامـەی روخـسارو دەمو چـاو بکـەین. ئەمانـە کەئـەدگاری وردی نموونـەکانیان دەکێـشن و وادەکـەن وەکـوو واقیـع وابـن، لەڕاسـتەقینەی خۆیـان باشـتر وێنەیان دەکێشن. بەهەمان شێوە، شاعیر کەوێنـەی کەسێکی وا دەکێشیّ کـەزوو هەڵبـچیّ، یـان کەسـێکی وا کـەزۆر هـێمن و لەسـەرخۆ بـیّ، یـان کەسـێکی وا کـە کـەمو کـورتی تـری لەکەسـێتیدا هـەبیّ، دەبـیّ ئـەم سیفەتانەی پیّ بداو لەهـەمان کاتیشدا وەکوو مرۆڤی ڕێك و پێك پێشانی بـدا، وەکـوو ئـەوەی (ئـەگاتۆن) و (هـۆمیروس) وێنـەی (ئـەخیلوس)یـان کێشاوە.

شاعیر دەبیّ ئەم خالانە زۆر بەوردی ڕەچاو بکا، لەگەڵ ئەو هۆیانـەی سـەرنج ڕادەکێـشن کەئـەوانیش بـەش بـەحاڵی خۆیـان پـشت بەهونـەری شاعیرەکە دەبەستن، چونکە لێرەش لەوانەیە زۆر جار تووشی هەڵە ببیّ. من لەبەرهەمە بڵاوکراوەکانما[٤] بەتێری باسی ئەو مەسەلانەم کردووە.

# بەشی شازدەم

## جۆرە جیاوازەکانی ناسینەوە

پێشتر باسم کرد مەبەستم لە(ناسینەوە) چییە؟ ئێستاش جۆرە جیاجیاکانی ناسینەوە ئەمانەن:

یەکەمیان لەهەموو جۆرەکانی دی لەهونەر دوورترەو لەبەرئەودی گیانی داهێنانی تێدا نییە لەوانی دی زیاتر بەکاردێ. ئەم جۆرە ناسینەوەیە بەهۆی نیشانەی بەرچاوەوە دێتە دی. نیشانەکانیش بۆی هەیە زگماك بن، وەکوو (ئەو سەرەرمانەی لەلەشی نەوەکانی زەوییدا هەن)[1]، یان ئەو (ئەستێرانە)ی (کارکینوس)[2] لە(پێستییس) دا بەکاریان دێنێ.

بۆیشی هەیە نیشانەکان لەوانەبن کەپەیدا دەبن، چ نیشانەی سەر لەش بێ وەکوو (جێ برین) و چ شتی دەرەکی بێ وەکوو گەردانە. یان وەکوو ئەوەی لە (تێرو)دا ناسینەوەکە بەهۆی (بێشکە) [3]وە دێتەدی.

هەندێ جۆری بەکارهێنانی ئەم نیشانانە لەوانی دی باشترن. بۆنموونە، کە(ئۆدیسوس) بەهۆی (جێبرین)ەکەیەوە دەناسرێتەوە. پەرستارەکەی بەجۆرێكو بەرازەوانەکان بەجۆرێکیتر دەیناسنەوە[4].

ئەو ناسینەوانەی تەنیا ڕاستەقینەی کەسەکە دەردەخەن کاریگەرییان کەمترە، هەر جۆرە ناسینەوەیەکی تریش کە بۆ ئەم مەبەستە

بەکاربێ هەر وایە. بەڵام ناسینەوەی ڕەچاو نەکراو لەمانە باشترە . وەکو لە(ئۆدیسە)، کەلە(ئەپسیۆدی) خۆشووشتندا هاتووە.

جۆری دوەمی ناسینەوە ئەوەیە کەشاعیرەکە خۆی دروستی دەکا. بۆیە ئەمە شتێکی هونەری نییە. بۆ نموونە وەکوو لە (ئیفجینیا لەتۆریس)دا هاتووە، لەوێ (ئۆرێستێس) خۆی ئاشکرا دەکا کەکیە، کەچی پێناسەی ئیفجینیا بەهۆی نامەکەوە دەردەکەوێ. ئەو قسەی (ئۆرێستێس) دەیکا، شاعیرەکە خستووتیە سەر زاری ئەم، چونکە خۆی پێویستیەتی، نەك قسەکە لەناخی چنینەکەوە هەڵقوڵابێ. ئەمەش زۆر لەو چەوتیەوە دوور نییە کەنەختێ پێش ئێستا باسم کرد، چونکە لەوانە بوو ئۆرێستێس هەندێ دیاریش بێنێ. نموونەیەکی تر وەکوو (دەنگی خەڕەك) لەشانۆگەری (تێریوس)[٥]ی سۆفۆکلیسدا.

جۆری سێیەمی ناسینەوە ئەوەیە کەبەهۆی یادو بیرەوەری بێ. واتە دیمەنی شتێ، شتێکی تر لەمێشك دەبزوێنێ. بۆنموونە لە(قوبرسییەکان)ی (دیکایگۆنیس)[٦]دا، (تویتکەر) کەچاوی بەوێنەکە دەکەوێ لەپرمەی گریان دەدا.: هەروەها لە(ئەلکینوس)دا، ئۆدیسیوس کەدەنگی چەنگی سترانبێژەکە، رابردووی بیر دەخاتەوە، دەست بەگریان دەکا. ئەم دووانە بەم جۆرە دەناسرێنەوە.

جۆری چوارەم بەهۆی ئەنجامگیریو بەڵگەی ژیربێژییەوە دێتە دی. وەکوو لە (کۆیفۆری)دا هاتووە کەدەڵێ ( یەکێ هاتووە وەکوو من وایە، تەنیا (ئۆرێستێس) یش وەکوو من وایە، کەواتە ئەوەی هاتووە ئۆرێستێسە).

نموونەیەکیتر وەکوو ئەوەی (پۆلیدوس) [٧]ی سوفستایی بۆ (ئیفیجینا) پێشنیاری دەکا، چونکە زۆر پێ دەچێ ئۆرێستێس

لێکدانەوەو هەڵێنجانێکی بەم چەشنە بکات کە: مادام خوشکی کراوەتە قوربانی، هەر بەو جۆرە چارەنووسی خۆیشی ئەوە دەبێ کەبکرێتە قوربانی).

هەروەها لەشانۆگەری (تیدیوس)[8] ی (تیۆدێکتس)[9] دا، (ئەپسیۆدیك) هاتووە: باوکەکە دێ بۆئەوەی کورەکەی بدۆزێتەوە کەچی بۆی دەردەکەوێ کەخۆی دەبێ لەناوبچێ. شتێکی وا لەشانۆگەری (فینایدا) [10]شدا هاتووە: ژنەکان کەچاویان بەجێگاکە دەکەوێ، تێدەگەن دەبێ هەر لەوێ بمرن، چونکە لەکاتی لەدایکبووندا، لەوێ رسوا کرابوون.

جۆرە ناسینەوەیەکی ساختە، یان خەیاڵیش هەیە بەهۆی ئەنجامگیریی نا دروستی لایەنە پەیوەستەکانەوە سەر هەڵدەدا. وەکوو لە(ئۆدیسوس – تەتەری ساختە)[11] دا کە : بێئەوەی خۆی کەوانەکەی دیبێ، دەڵێ من کەوانەکە دەناسمەوە، لایەنەکەی تر ئەم ئەنجامەیان بەدەست هێنا کەدیارە کەوانەکە دەناسێتەوە، بەڵام ئەنجامگیرییەکە چەوت دەرچوو.

لەم هەموو جۆرە ناسینەوانەدا، باشترینیان ئەوەیە لەناو رووداوەکانەوە سەر هەڵبدا چونکە دۆزینەوەی راچڵەکێن لەڕووداوی شیاوەوە پەیدا دەبێ، وەکوو لە (ئۆدیپوس) ی (سۆفۆکلیس) دا هاتووە، یان وەکوو لە (ئیفجینیا)دا هاتووە چونکە زۆر لەگوێن بوو (ئیفجینیا) [12] ئارەزووی ناردنی نامەکەی بکات.

ئەم جۆرە دیمانەی ناسینەوە، تاکە ناسینەوەیەکە پێویستی بە هاوکاری شتی دەستکردی وەکوو یادگارو گەردانە نییە. لەدوای ئەمەوە، باشترینیان ئەوەیە کەپشت بەژیریو ئەنجامگیری دەبەستێ.

# بەشی حەڤدەم

## هەندێ دەستوور بۆ شاعیرانی تراجیدی

شاعیر کەچنینەکان دەخاتە پاڵ یەکترو ئاخاوتنی وا بەکار دێنێ لەگەڵ چنینەکان بگونجێ، دەبێ بەپێی توانا هەمیشە دیمەنەکەی لەبەرچاو بێ، هەموو شتێ بەچاکی ببینێ، وەکوو خۆی رووداوەکانی بەچاوی خۆی دیبێ، ئەوسا دەتوانێ شی گونجاو بدۆزێتەوەو زۆر چاك لەشتە ناکۆکەکان بگات. بۆنموونە وەکوو ئەو گازاندەی لە (کارکینوس) دەکرێ، چونکە وای کردووە (ئەمفیارۆس)[1] لەناو پەرستگا بێتە دەرەوە. ئەگەر رووداوەکە بەچاو نەبینرایە، ئەمە هەر تێبێنی نەدەکرا، بەڵام ئەمە وای کرد تەماشاکەرەکان ڤینیان بجۆشێ‌و ئیتر شانۆگەرییەکە شکستی هێنا[2].

هەروەها شاعیری درامی دەبێ، بەپێی توانا، قسەو جولانەوەی شیاو بەیەکەوە بەکاربێنێ، چونکە لەو شاعیرانەی بەهرەو توانایان وەکوو یەك وابێ، ئەوانەی بەراستی وادەکەن خۆیان هەست بەسۆزی پەیوەست بکەن،

لەهــەموویان سەرنجراکێـشترن. ئـەوەی خـۆی ورووژابــێ، یــان لەحاڵـەتی جــۆش و خرۆشــدا بــێ، دەتوانــێ بەزینــدوویی رق و ورووژانــی خــۆی دەربــبڕێ[٣]. لێــرەدا شــیعر، یــان بەرهــەمی کابرایــەکی خــاوەن بــەهرەو توانایەکی گەورەیە، یان بەرهەمی کابرایەکە کەهۆش و ئاوەزی تەواو نییە. یەکەمیان زۆر سرک و ناسکەو دووەمیان لێوەو سەر شێتە.

بــەش بــەحاڵی چــیرۆکەکانیش، چ حازربەدەســت بــن و شــاعیرەکە وەریان بگرێ و چ خۆی دایانبنێ، دەبێ یەکەم جار هێڵی گشتی بکێشێ، ئینجا پاشان بەرووداوی گونجاو پــەرەی پــێ بدا. ئـەوەی من لەکێشانی هێڵی گشتی مەبەستمە، بەشانۆگەری (ئیفجینیا) روون دەبێتــەوە کەبەم جۆرەی خوارەوەیە:

کــچێکی بەربــەخت دەبــەن بۆئــەوەی بیکــەن بــەقوربانی، بــەڵام بەشـێوەیەکی ئـاڵۆز لەبەرچـاوی ئەوانـە بـزر دەبـێ کەخـەریکن دەیکـەن بەقوربانی.

کچەکە دەکەوێتە وڵاتێکی تر. لەوێ رەوشتیان وایە، هـەر بێگانەیـەك بێ بۆ (خـوا)[٤] کـەیان دەیکـەن بـەقوربانی. کـچەکە لـەوێ دەبـێ بـەکاهینی جێبەجێکردنی ئەم دابە. دوای ماوەیەك بەرێکـەوت بـرای کـچەکە دەچێتە ئەو وڵاتە[٥] (لەڕاستیدا، هۆی هەرچی هـەبێ ئیلهامی یـەزدانی بەکوڕەکـەی راگەیانـدبوو بچێتە ئـەو وڵاتـە. مەبەسـتی چـوونەکەی شـتێکە دەکەوێتـە دەرەوەی چنینی شـانۆگەرییەکە). کەکوڕەکـە دەگاتـە ئـەوێ دەسـتگیری دەکەن و لـەو دەمەیدا کەدەیانـەوێ بیکـەن بـەقوربانی، خـۆی ئاشکرا دەکا کێیــە، بــەو جــۆرەی کــە (یۆریپیــدیس) دەیهێنێــ، یــان بــەو شــێوەی (پۆلیدوس) پێشنیازی دەکا کەکوڕەکە بەسـەلیقەی خـۆی هـاوار دەکا کە:

نەك هەر خوشكى چارەنووسى وابووە بكرێ بەقوربانى، بكرە خۆيشى وا دەكرێتە قوربانى، بەم جۆرە رزگارى دەبێ.

كەشاعیرەكە گەیشتە ئەم قۆناغە، ئیتر دەشێ ناوى شیاوو پێویستى بۆ زیاد بكات و بەرووداوى گونجاو پڕى بكاتەوە، وەكوو (ئۆرێستێس) كەشێتایەتى گرتنى، دەبێ بەهۆى بەدیل گیرانىو پاكبوونەوەى، دەبێ بەهۆى رزگار بوونى[٦].

بێگومان رووداوەكانى شانۆگەرى كورتن، بەلام لەداستانى شیعریدا رووداوەكان درێژایى پێویست دابین دەكەن. بۆنموونە چیرۆكى (ئۆدیسە)، خۆى چیرۆكێكى درێژ نییە: كابرایەك ماوەى چەند ساڵێك لەماڵى خۆى دوور دەكەوێتەوە. (پۆزیدۆن) بەچاوى ئێرەیى زێڕەڤانى دەكات. كابرا یەكتەنێیە. رەوشى ماڵەوەشیان ئەوەیە داخوازیكەرانى ژنەكەى سامانەكەى بەبا دەدەن و پلان بۆ كوشتنى كوڕەكەى دادەنێنەوە. كابرا، دواى ئەوەى لەچەند گەرداوێك دەرباز دەبێ، دەگەڕێتەوە ماڵێ و خۆى ئاشكرا دەكا. دەكەوێتە ناو دوژمنەكانىو لەناویان دەباو ژنەكەى خۆى وەردەگرێتەوە. ئەمەیە چیرۆكى بنەڕەتى (ئۆدیسە)، ئەوەى ترى داستانەكە هەمووى بەرووداوى ترەوە پڕ كراوەتەوە.

## بەشی هەژدەم

# چەند دەستووری تریش
# بۆ شاعیرانی تراجیدی

هەر تراجیدییەك گرێی خۆیو کردنەوەی گرێی خۆی هەیە. گرێ لەهەندێ رووداوی دەرەوەی چنینو هەندێ رووداوی ناوەوەی چنین پێك دێو ئەوەی تر بریتیە لەکردنەوە [1]. مەبەستم لە(گرێ) ئەو بەشەی چیرۆکەکەیە کەلەسەرەتاوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە خاڵی پێش وەرچەرخانی بەرەو چارەنووسی چاك. یان خراپ. مەبەستیشم لە(کردنەوە) ئەو بەشەیە کەلەسەرەتای وەرچەرخانەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە کۆتایی. بۆنموونە: لەشانۆگەری (لینکوس)ی (تیۆدیکتس)دا: گرێیەکە ئەوەیە، کە پێش رووداوەکانی شانۆگەرییەکە خۆی، قەوماون: شان بەشانی دەستگیرکرانی کوڕەکە و ئینجا دەستگیرکرانی دایبابیشی، کەچی کردنەوەکە لەو کاتەوە دەست پێ دەکا کەبەکوشتن تاوانبار دەکرێو تا کۆتایی درێژە دەکێشێ. بەوردی بڵێین، بۆئەوەی وەکوو یەکەم شت، باسی لێکچوونو جیاوازی چنینی شانۆگەرییە تراجیدییەکان بکەین، دەبێ شانۆگەرییەکان لەبارەی (گرێ) و (کردنەوە)وە، یەك بگرنەوە. زۆر شاعیر هەن لەگرێدانی چنینەکاندا کارامەن، بەڵام

لەکردنەوەی گرێکەدا بێدەسەڵاتن. کەچی هەردوو تەکنیکەکە پێویستیان بەوردەکاری هەیە، واتە شاعیر دەبێ لەهەردووکیان کارامە بێ.

چوار جۆرە تراجیدی هەن، واتە ژمارەیان بەقەدەر ژمارەی بەشە پێکهێنەرەکانی تراجیدییە، کەپێشتر باسم کرد.

ـ تراجیدی ئالۆز[٢]: ئەمە بەتەواوی پشت بە (وەرچەرخان) و (ناسینەوە) دەبەستێ.

ـ تراجیدی ئازار [٣] : وەکوو ئەو شانۆگەرییە جۆراوجۆرانەی لەبارەی (ئەجاکس)[٤] و (ئیکسیۆن) [٥] نووسراون.

ـ تراجیدی کەسێتی [٦]: وەکوو شانۆگەری (فیتیۆتیدیس) [٧] و (پیلیوس) [٨].

ـ چوارەم، تراجیدی دیمەن: وەکوو شانۆگەری (فۆرسیدیس)[٩] و (پرۆمیتوس)[١٠] و ئەو شانۆگەرییانەی دیمەنەکانیان لە(هادیس) [١١]ەوە وەرگیراون.

شاعیر پێویستە هەوڵ بدا، بەپێی توانا، ئەم هەموو رەگەزانە بخاتە ناو شانۆگەرییەکەوە. ئەگەر ئەمەشی پێ نەکرا، دەبێ بەپێی توانا زۆرترین و گرنگترین رەگەز وەربگری – بەتایبەتی، لەبەرئەوەی ئەمڕۆ شتێکی باوە کەم و کورتی لەشاعیرەکان دەدۆزنەوە، چونکە شاعیرەکە بەرەورووی شاعیرانیتر دەبێتەوە، کەهەریەکە رەگەزێکی لەم رەگەزانە بەچاکی بەکارهێناوە. ئیتر ئێستا رەخنەگرەکان چاوەڕێی ئەوەن کەیەك شاعیر لەو هەموو رووەوە سەرکەوتوو بێ کەهەریەکە لەشاعیرانی پێشوو لەیەکێکیان سەرکەوتوو بووە.

شاعیری درامی پێویستە قسەکانی پێشووی منی لەبیر بێ و دەبێ وریابێ تراجیدییەکەی لەسەر شێوەی پێکهاتەی داستان نەنووسێ.

مەبەستم لە (پێکهاتەی داستان) ئەوەیە کەزۆر چیرۆکی تێدا بێ. وەکوو ئەوەی یەکێ هەوڵ بدا چنینێکی وا بنووسێ هەموو چیرۆکەکانی (ئیلیادە)ی تێدا کۆببێتەوە. (ئیلیادە) بۆی هەیە بەهۆی سروشتی درێژی خۆیەوە، بواری پەرەسەندنی گونجاوی بەشە جیاجیاکانی هەبێ. بەڵام لەشانۆگەریدا، وەك بەتاقیکردنەوە سەلماوە، ئەم جۆرە هەوڵە ئەنجامێکی بێهوودەی بەدەمەوەیە، چونکە ئەو شاعیرانەی سەراپای کاولکاری (تەروادە)یان کردووە بەدراما، نەك وەك (یۆریپیدیس) کەتەنیا چەند بەشێکی لێ وەرگرتووە، یان سەراپای چیرۆکی (نیۆبێ)[12] یان وەرگرتووە، نەك وەك ئەوەی (ئەسخیلوس) کردوویەتی، ئەمانە یان هەر بەتەواوی شکستیان هێناوە، یان لەپێشبڕکێی درامیدا باش نەبوونە. لەڕاستیدا، یەکێ لەشانۆگەرییەکانی (ئەگاتۆن) هەر تەنیا سەبارەت بەم هۆیە شکستی هێنا، لەگەڵ ئەمەشدا، بۆی هەیە ئەم شاعیرانە، لەداڕشتنی (وەرچەرخان)و (چنینی سادە) دا، بەلێزانینی خۆیان ئەم کاریگەرەی دەیانەوێ دەستەبەری بکەن، واتە ئەو کاریگەرەی شتێکی تراجیدییەو لایەنی مرۆڤایەتیمان دەدوێنێ. ئەمە ئەو کاتە دێتە دی کەپیاوێکی زیرەكو لەهەمان کاتدا بەدکاری وەکوو (سیزیفوس)[13] فریو دەخوا، یان پیاوێکی ئازا لەهەمان کاتدا هەڵەشە، دەبەزێ. ئەمەش ئەنجامێکی لەگوینە، هەروەکوو (ئەگاتۆن) دەڵێ: زۆر ڕێی تێدەچێ گەلێ شت بەپێچەوانەوەی شیانو ئیحتیمالەوە رووبدەن[14].

پێویستە کۆرس وەکوو یەك ئەکتەر مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ. دەبێ بەشێکی تێکچڕژاو بێ لەسەراپای کارەکەو بەشدارییەکی دروست و ڕاستەقینە لەکردەوەکەدا بکات. وەکوو لای (سۆفۆکلیس) هاتووە، نەك (یۆریپیدیس)، کەچی لای شانۆگەرینووسەکانیتر، بۆی هەیە گۆرانی

کۆرس هیچ پەیوەندی بەچنینەوە، یان بەتراجیدییەوە نەبێ. ئەمانە تەنیا وەکوو پێشووی کۆرس بەکاردێن، بەوشێوەی یەکەم جار (ئەدگاتۆن) پەیڕەوی کردووە. بەڵام ئایا چ جیاوازییەک هەیە لەنێوان چڕینی گۆرانییەکی لەتراجیدی ئاخنراو لەگەڵ گواستنەوەی گوتارێ، یان چیرۆکێکی تەواو، لەشانۆگەرییەکەوە بۆ شانۆگەرییەکی تر.

# بەشی نۆزدەم

## هزرو زمان

دوای باس کردنی بەشەکانی تراجیدی، ئێستا ماوەتەوە سەر ئەوە شتێ لەبارەی هزرو زمان باس بکەم

بەش بەحاڵی (هزر)ەوە، لەلێکۆڵینەوەی (گوتارناسی – ریتۆریکا)[1] دا باسم کردووە، چونکە بابەتەکە زیاتر پەیوەندی بەو لێکۆڵینەوەدیە هەیە. (هزر) هەر جۆرە کاریگەرییەك دەگرێتەوە کەبەهۆی زمانەوە بێتە دی، وەکوو: بەڵگەو بەرپەرچدانەوە، و وورووژاندنی سۆزی وەکوو (بەزەیی) و (ترس) و (رق) و شتی وا، هەروەها قەبەکردنی شتی وردیلە و بچووك کردنی شتی زل[2]. ئاشکرایە، هەرکاتێ پێویست بکا کەکاریگەری (بەزەیی)، یان (تۆقاندن)، یاخود کاریگەری مەزنایەتی، یان شیاویی بێتە دی، دەبێ هەمان بنەما لەکردەوەی شانۆگەریدا رەچاو بکرێ، بەڵام لەگەڵ جیاوازی ئەوەی کەکاریگەرەکە دەبێ بەبێ روون کردنەوەی زارەکی بێتە دی. کەچی ئەو کاریگەرەی لەزمانەوە دێ، دەبێ لەئاخاوتنی قسەکەرەوە

بێ بەو شێوەی لەزاری دێتە دەرێ، چونکە ئەگەر کاریگەری پێویست بەبێ بەکارهێنانی زمان بێتە دی، چ پێویست بەقسەکەر دەکات؟

بەش بەحاڵی زمانیش، لقێکی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە مامەڵە لەگەڵ شێوە جۆراوجۆرەکانی دەربڕین دەکا. ئەم جۆرە زانینە تایبەتە بەهونەری (گوتاردان)و شتێکی پێویستە بۆ پارێزەرانی ئەم هونەرە. لێرەدا، من مەبەستم شتی وەکوو ئەمانەیە:

فەرمان و پارانەوەو خەبەرو هەڕەشەو پرسیارو وەڵام و شتی وا.

شاعیر ئەم شتانە بزانێ، یان نەزانێ، لەسەر ئەوە رەخنەی لێ ناگیرێ. چونکە، ئاخۆ قسەکەی (هۆمیرۆس) کەدەڵێ:

(خودایە، سروودی رق بلێرەوە!) [3]. چ هەڵەیەکی تێدایە تا پرۆتاگۆس رەخنەی لێ بگرێ؟ پرۆتاگۆس دەڵێ: ئەگەر داوا لەیەکێ بکەی ئیشێ بکا، یان نەیکا، ئەمە فەرمانە. بەڵام (هۆمیرۆس) مەبەستی تکاو پارانەوەیەو بەشێوازی فەرمان دەریبڕیوە.

بەهەرحاڵ، دەتوانین ئەم بابەتە بنێینە لاوە. چونکە هەرچەندە لەوانەیە پەیوەندی بەهونەری ترەوە هەبێ. بەڵام پەیوەندی بەهونەری شیعرەوە نییە[4].

# بەشی بیستەم

## هەندێ پێناسەی زمانەوانی

زمان بەگشتی[1] لەم بەشانەی خوارەوە پێک دێ: تیپ، بڕگە، ئامرازی پەیوەندی، ئامراز، ناو کار، گەردان کردن، یان دۆخ و دەستەواژە، یان ڕستە.

تیپ ئەو دەنگەیە کەدابەش نابێ. ئەویش نەک هەر دەنگێکی هەبێ، بەڵکو ئەو دەنگەی دەشێ زمانێکی واتاداری لێ دروست بێ. ڕاستە، گیاندارەکانی تریش دەنگی وا دەردەبڕن کەدابەش نابێ، بەڵام ئەمانە هیچیان بەتیپ نازانم. جۆرەکانی دەنگ بریتین لە: بزوێن و نیمچە بزوێن و تیپی بێدەنگ، یان نەبزوێن.

بزوێن: ئەو تیپەیە کەبەبێ بەیەک کەوتنی دوو ئەندامی ئاخاوتن دەنگێکی بیسراوی هەیە.

نیمچە بزوێن: بۆ نموونە وەکوو (س)و (ر)، بەهۆی بەیەک کەوتنی دوو ئەندامی ئاخاوتن دەنگێکی بیسراوی پێ دەدرێ.

نەبزوێن: ئەو تیپەیە لەگەڵ ئەم جۆرە بەیەک کەوتنەی دوو ئەندامی ئاخاوتنیش دەنگی تایبەتی خۆی نییە، تەنیا ئەوکاتە دەنگی دەردەچێ کەلەگەڵ تیپی تری دەنگدار خۆی لێک دەدا. بۆ نموونە وەکو (گ) و (د).

تیپەکان، بەگوێرەی شێوەی زارو سازگەیانو بەگوێرەی کپی یان گڕیو بەگوێری کورتی یان درێژیو بەگوێرەی تیژی، یان نزمی، یان ناوەنجێتی، دەنگەکانیان لەیەك جیا دەبنەوە. لێکۆڵینەوەی دوورودرێژی ئەم بابەتانە کاری کێشناسەکانە.

بڕگە یەکەیەکی دەنگی بەبێ مانایە. لەتیپێکی بێدەنگو دەنگدارێك دروست دەبێ (گـ) بەبێ ئەوەی (ا)ی لەگەڵ دا بێ بڕگەیە، (ا)یشی لەگەڵدابێ هەر بڕگەیە وەکوو (گرا). ئەم جۆرە جیاکاریانەش هەر کاری بیردۆزەی کێشناسین.

ئامرازی پەیوەندی: یەکەیەکی دەنگییە، دەلالەتی نییە نەدەبێتە لەمپەرو نەدەبێتە یاریدەدەری پێکهێنانی تاکە دەربڕینێکی دەلالەتدار لەکۆمەڵە دەنگێكو نابێ بخرێتە سەرەتای دەستەواژەیەکی سەربەخۆ، بۆنموونە وەکوو (مێن) و (دی) و (تۆی) و (دێ)[2]. کەواتە دەنگێکی بەبێ دەلالەتە دەتوانێ دەربڕینێکی دەلالەتدار لەکۆمەڵە دەنگێکی خاوەن دەلالەت بەرهەم بێنێ. بۆنموونە، وەکوو وشەی (ئەمفی) و (پێری)و ئەم جۆرە وشانە.

ئامراز: دەنگێکی بێ دەلالەتە. ئاماژەیە بۆ سەرەتا، یان کۆتایی ئاخاوتن، یان خاڵی دابەشکردنی ناوەڕاستە. شوێنی سروشتی خۆی، یان کۆتاییەو، یان ناوەڕاستە[3].

ناو[4]: لەچەند دەنگێك پێك دێ و مانای هەیە، بەلام چەمکی (کات)ی تێدا نییە، هیچ تاکە پارچەیەکی مانای سەربەخۆی نییە، چونکە لەوشەی لێکدراودا مانای سەربەخۆ بەپارچەکان نادەین. بۆنموونە لەناوی (تیۆدۆری)دا، پارچەی (دۆری) خۆی لەخۆیەوە هیچ مانا ناگەیەنێ.

کار: لەچەند دەنگێک پێک دێ و مانای هەیە و بە کات بەستراوەتەوە، وەکوو (ناو) هیچ پارچەیەکی سەربەخۆی کاتی مانای تایبەتی خۆی نییە. وشەی وەکوو (پیاو) و (سپی) هیچ چەمکی (کات) یان تێدا نییە، بەڵام وشەی (دەڕوا) یان (ڕۆیشت) کاتی ئێستا و ڕابردوو دەگەیەنن.

ڕۆخ، یان گەردان لەناوو کاردا، ئەوەیە کەمانای (هی) یان (بێ) و شتی لەم بابەتە دەدا، یان ژمارە دەگەیەنێ، چ یەک بێ و چ زۆر، وەکوو (پیاو) و (پیاوان)، یان بۆی هەیە جۆرەکانی ئاوازی دەنگ دەربڕێ لە(پرسار) و (فەرمان) وەکوو: (ڕۆیشت؟) و (دەڕوا!) کەبریتین لەگەردان کردنی کار بەم شێوەی دواوە.

دەستەواژە، یان ڕستە: لەچەند دەنگێک دروست دەبێ. مانای هەیەو هەندێ لەپارچەکانیشی مانای تایبەتی خۆیان هەیە. مەرج نییە هەموو ڕستەیەک لەناوو کار دروست ببێ – بۆنموونە وەکوو پێناسەی مرۆڤ. ڕستە بۆی هەیە بەبێ کار دروست ببێ [5]. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لەپارچەکانی هەمیشە مانای تایبەتی خۆیان هەیە. وەکوو (کلیۆن) لەڕستەی (کلیۆن دەڕوا) دا. ڕستە ، یان دەستەواژە. دەشێ بەدوو ڕێگا یەکێتی دروست بکا: یان بەوە کەتەنیا تاکە شت بگەیەنێ. یان بەوە کەبەلێکدانی چەند پارچەیەک یەکێتییەکە دەستەبەر بکا. بۆ نموونە یەکێتی (ئیلیادە) لەوەدایە کەلەچەند پارچەیەکی پێکەوە لکاو دروست بووەو پێناسەی مرۆڤیش یەکەیەکی سەربەخۆیە چونکە یەک تاکە شت دەگەیەنێ.

# بەشی بیستو یەکەم

## زمانی شیعری

ناو دوو جۆرە: ناوی سادەو ناو ی لێکدراو. مەبەستم لە (ناوی سادە) ئەو ناوەیە لەچەند ڕەگەزێك پێك هاتووە کەبەشێوەی جیاو سەربەخۆ هیچ مانایان نییە. وەکوو وشەی (گی – زەوی) . ناوی لێکدراویش، یان پارچەیەکی واتادارەو لەگەڵ پارچەیەکی تر لێکدراوە. کەهیچ مانای نییە – هەرچەندە لەچوارچێوەی وشە لێکدراوەکەدا. هیچ پارچەیەك مانای جیاو سەربەخۆی نییە – یان لەچەند پارچەیەك پێك دێ کەهەموویان مانایان هەیە.

ناو، بۆی هەیە سێ پارچەیی، یان چوار پارچەیی – یان فرە پارچەیی بێ، ئەمە لەزۆر وشەی قەبەکراوماندا خۆی دەنوێنێ. بۆنموونە وەکوو وشەی (هێرمۆکایکۆکسانتوس Hermocaicoxanthu )[1]

هەر ناوێك، یان وشەیەکی باوە، یان وشەیەکی بێگانەی خوازراوەیە، یان خوازەیە، یان وشەی ڕازاندنەوەیە، یان داهێنانێکی شیعرییە، یان وشەیەکی درێژکراوەیە، یا کورت کراوەیە، یان دەستکاری کراوە.

مەبەستم لە (وشەی باو) ئەو وشەیەیە کەهەموو کەس بەکاری دێنێ و (وشەی خوازراوە) ئەو وشەیەیە کەخەڵکی تر بەکاری دێنن. بێگومان بۆی هەیە یەك وشە لەیەك کاتدا وشەیەکی باویش بێ و وشەیەکی خوازراویش بێ، بەلام بەلای هەمان خەڵکەوە نا. بۆنموونە، وشەی (سیگونۆن)[2] بەلای قوبرسییەکانەوە وشەیەکی باوە، بەلام بۆ ئێمە مانان وشەیەکی خوازراوەیە[3].

خوازە: ئەوەیە ناوی شتێك بۆ شتێکی تر بەکاربێ، ئەمەش بەهۆی گواستنەوە دەبێ لەرەگەزەوە بۆ جۆر، یان لەجۆرەوە بۆ رەگەز، یان لەجۆرەوە بۆ جۆر، یان بۆی هەیە بەهۆی پەیوەندی هاوئەرکی بێ.

بۆ گواستنەوە لەرەگەزەوە بۆ جۆرە، ئەم نمونەیە دێنمەوە. (کەشتێکەم لێرە وەستا)[4]، چونکە لەنگەرگرتن جۆرێکە لەوەستان.

گواستنەوە لەجۆرەوە بۆ رەگەز، لەم رستەیەدا دەردەکەوێ:

(لەراستیدا ، ئەدیسیوس دە هەزار کردەوەی بەرزی پێشکەش کردووە) لێرەدا ( دە هەزار)، کەژمارەیەکی تایبەتی گەورەیە، لەباتی وشەی (زۆر)[5] بەکارهاتووە.

گواستنەوە لەجۆرەوە بۆ جۆر، وەکوو لەم رستەیەدا دەردەکەوێ:

(دەرکێشانی رۆح بەشمشێری برۆنزی)، یان (پارچە پارچەکردن بەشمشێری زبری برۆنزی). لێرەدا، (دەرکێشان) لەباتی (پارچەپارچەکردن) و (پارچەپارچەکردن) لەباتی دەرکێشان بەکار هاتووەو هەردووکیان جۆری مردنن.

ئێستاش خوازە بەپێی پەیوەندی هاو ئەرکی روون دەکەمەوە. ئەمە ئەوکاتە دێتە دی کەلەچوار شتدا، پەیوەندی دووەم بەیەکەمەوە، وەکوو پەیوەندی چوارەم بەسێیەمەوە وابێ. ئەوسا دەتوانین لەجیاتی دووەم

چوارەم بەکاربێنین و لەجیاتی چواردەم دووەم بەکاربێنین و هەندێ جاریش خەڵکی سیفەتێک بۆ خوازەکە زیاد دەکەن لەگەڵ ئەو وشەی جێی گرتۆتەوە دەگونجێ. بۆنموونە، پەیوەندی (بادە) بە (دیۆنیسیوس)ەوە وەکوو پەیوەندی (زرێ) وایە بە (ئاریس)ەوە. بۆیە دەشێ بەبادە بڵێین. (زرێی دیۆنیسیوس)[6] و بەزرێ بڵێین (بادەی ئاریس)[7]. یان نموونەیەکی تر، پەیوەندی تەمەنی پیریی بەژیانەوە. وەکوو پەیوەندی ئێوارە وایە بە رۆژەوە. ئیتر دەتوانین بەئێوارە بڵێین (پیریی رۆژ)و بەتەمەنی پیری بڵێین (ئێوارەی ژیان). یان (ئاوابوونی رۆژ). لەهەندێ حاڵەتدا، زاراوەی پەیوەندی هاوئەرکی هیچ ناوی نییە. ئەوسا خوازەکەو وەکوو خۆی بەکار دێنین. بۆنموونە پەرش و بڵاوکردنەوەی دانەوێڵە بۆ چاندن، پێی دەگوترێ (تۆودان)، بەڵام هیچ وشە نییە بۆ ئەوە بەکاربێ کەتیشك دەپرژێنێ. جا پەیوەندی ئەم بڵاوکردنەوەی تیشکە بەهەتاوەوە. وەکوو تۆودان وایە. لێرەدا دەربڕینێکی وەکوو (تۆودانی تیشکی خواکرد) بەکاردێ.

ئەم جۆرە خوازەیە دەشێ بەجۆرێکی تریش بەکاربێ کەناوی شتێ بەناوی شتێکیترەوە بکەین، دەتوانین سیفەتێکی ئەمەیان لابەرین. بۆنموونە، بە (زرێ) نەڵێین (بادەی ئاریس) . بەڵکو پێی بڵێین (بادەی بێ شەراب).

وشەی داهێنانی شیعری: وشەیەکە لەناو خەڵك بەکارنەهاتووە. شاعیر خۆی دایدەهێنێ. دیارە ئەم جۆرە وشانە هەن وەکوو (چرۆ) بۆ (قۆچ) و (دوعاگۆ) بۆ قەشە – کاهین–[8].

وشە، ئەو کاتە درێژ دەبێتەوە کەبزوێنێکی لەبزوێنی ئاسایی خۆی درێژتر بەکاربێنێ. یان برگەیەکی بۆ زیاد بکا. ئەوکاتەش کورت

دەکرێتەوە کەپارچەیەکی لێ لابدرێ. نموونە بۆ درێژبوونەوەی وشە، وەکوو بەکارهێنانی وشەی (پۆلیۆس) بۆ (پۆلیوس) و وشەی (پۆلێیدرەو) بۆ (پۆلێیدەو). نموونەی کورت کردنەوەش وەکوو وشەی (کرێ) بۆ (کریت) و وشەی (دۆ) بۆ (دۆما) و وشەی (ئۆپس) بۆ (ئۆپیس). ئەمە لەکۆتایی دێرێکی ئەمپیدۆکلیس هاتووە کەدەڵێ:

(( میا گیوێتای ئامفۆتێرون ئۆپس – واتە ڕوخساری جووتەکە وەکوو یەك شتیان لێ هات))

وشەی دەستکاری کراو: ئەو وشەیەیە کەبەشێکی بەبێ گۆڕان دەمێنێتەوەو بەشێکی دادەڕێژرێتەوە، وەکوو ئەوەی کە (دێکسیتێرۆن) لەباتی (دێکسیۆن) بەکارهاتووە لە، (دێکسیتێرۆن کاتا مازۆرن – واتە لەسەر سنگی تەواو)

ناو، خۆیان هەندێکیان نێرن و هەندێکیان مێن و هەندێکیان تیانن (واتە نەنێرو نەمێن) [٩]

ناوی نێر: هەموو ئەو ناوانە دەگرێتەوە کەکۆتاییان بە(ن) و (ر)و (س) دێ لەگەڵ ئەو تیپانەی لەگەڵ (س) لێك دەدرێن وەکوو (پس) و (کس).

ناوی مێ: هەموو ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە کۆتاییان هەمیشە بەبزوێنی درێژ دێ، وەکوو (ێ) و (ۆ)، (ا) یش لەو بزوێنانەیە کەدەشێ درێژ بکرێتەوە.

بەم جۆرە نیشانەی ناوی نێرو ناوی مێ ژمارەیان بەقەدەر یەکە، چونکە (پس) و (کس) لەگەڵ (س)دا هاوسەنگن.

هیـــــچ ناوێك كۆتایی بەنەبزوێنی بێدەنگ، یان بەبزوێنی كورت، نایە، تەنــیا سێ نـــاو كۆتاییـان بە (ی) دێ: (مێلـی -- هـەنگوین( و (كۆمی - چرك)و (پێپەری- بیبەر).
ناوە تیانەكان بۆی هەیە كۆتاییان بەم بزوێنانەو بە(ن) و (ر)و (س) بن.

# بەشی بیست و دووەم

## زمانی شیعریی و شێواز

گەورەترین خەسیەتی چاکی زمانی شیعریی ئەوەیە کەڕوون و ئاشکرا بێ، بێ ئەوەی سواو بێ. زمانی شیعریی ئەوکاتە روون و ئاشکرا دەبێ کە لەوشەی رۆژانە دروست بێ، بەڵام ئەمەیان شتێکی سواوە وەکوو شیعری (کلیۆفۆن) و (ستینیلۆس)[1] . لەلایەکی ترەوە، ئەو زمانە شیعرییەی وشەی نابای تێدا بەکاربێ، بەرزی و شکۆمەندیی تێدایەو لەسەرووی ئاستی زمانی رۆژانەوەیە. مەبەستم لەبەکارهێنانی (وشەی ناباو) وشەی خوازراوەو وشەی درێژکراوەو هەر شتێکی ترە کە لەحاڵەتی ئاسایی بەدەر بێ، بەڵام ئەگەر تەنیا ئەم جۆرە وشانە[2] بەکاربهێنرێن، ئەمە دەبێ بەهۆی دروست بوونی مەتەڵ، یان ئاڵۆزوبڵۆزی: ئەگەر هەموو وشەکان خوازەیی بن دەبێ بەمەتەڵ و ئەگەر هەموو وشەکان هاوردە بن دەبێ بەئاڵۆزی وبڵۆزی.

مەتەڵ ئەوەیە بەزمانێکی ئاوێتەی سەخت و ئەستەم شت دەربڕێ. ئەمە تەنیا بەوە نابێ کەزاراوەی ئاسایی بەدوای یەکەوە بێن.، بەڵکو بەهۆی خوازەوە دەبێ وەکوو ئەم مەتەڵەیە:

(پیاوێکم بینی بەئاگر برۆنزی بەپیاوێکی ترەوە دەلکاند)[3]

هەروەها نموونەی تری لەم بابەتە.

بەهەمان شێوە وشەی هاوردە دەبێ بەهۆی ئالۆزوبلۆزی، بۆیە پێویستە ئەم ڕەگەزە جیاجیانە تێکەڵ بەیەکتر بکرێن، چونکە جۆرێکیان: واتە وشەی ناباوو خوازەو زاراوەی جوانکاری‌و هونەرەکانی تر کەباسم کردن لێ ناگەڕێن زمان نزم‌و سواو بێ‌و جۆرەکەی‌تریشیان: واتە بەکارهێنانی وشەی ڕۆژانە، ڕوونی و ئاشکرایی پێویست دەستەبەر دەکات.

بەکارهێنانی وشەی درێژکراوەو وشەی کورتکراوەو وشەی دەستکاری کراو هۆیەکی هەرە گرنگ‌و کاریگەرە بۆ دابین کردنی ڕوونی‌و شکۆمەندیی لەزمانی شیعریدا. لەهەمان کاتدا، ئەو ناباوییەی لەبەکارهێنانی شتی ئاسایی دێتە کایەوە، دەبێ بەهۆی دەستەبەرکردنی زمانێکی شیعری لەسەرووی زمانی پەست‌و سواوەوە، کەچی هێشتنەوەی هەندێ بەشی ئاسایی دەوری ڕوون‌و ئاشکرا کردنی تێدا دەبینێ. کەواتە شتێکی بەجێ نییە ڕەخنە لەم زمانە بگیرێ‌و گاڵتە بەو شاعیرە[٤] بکرێ کەبەکاری دێنێ، وەکوو (ئیکلیدس)[٥] ی بەساڵداچوو شتی وای کردووە کەدەڵێ: شیعر نووسینی ئاسانە، ئەگەر هەرکاتێ حەز بکەی بتوانی برگەکان درێژ بکەیتەوە، هەروەکوو لەم دێرە شیعرانەدا، گاڵتە بەم جۆرە شێوازە دەکات، دەڵێ:

- (( ئێپیکاروسم بینی بەرێوەبوو بەرەو ماراتۆن دەچوو))

یان کە دەڵێ:

(( بێ‌ئەوەی مەترسی خەربەقی تیا هەبێ)) [٦]

کەواتە زیادەڕۆیی لەبەکارهێنانی هەریەکە لەم دووە، جێگای گاڵتەجارییە. لەهەموو جۆرە نووسینێکدا میانڕەویی کارێکی پێویستە. هەرکەسێ خوازەو وشەی خوازراوەی نابـاو و شتی وا بەنەشیاوی

بەکاربێنن بەو ئەنجامە دەگا کەیەکێ بیەوێ تەنیا بۆ گاڵتەو پێکەنین بنووسێ، بەڵام بەکارهێنانی دروستی ئەم هونەرە زمانەوانیانە کارێکی تەواو جیاوازە. بۆئەوەی جیاوازییەکەمان بۆ دەربکەوێ، پێویستە شیعرێکی داستانی وەربگرین و بزانین ئەگەر وشەی ئاسایی رۆژانەی تێ بخرێ چی بەسەردێ. هەرکەسێ وشەی باو لەجێگای وشەی ناباو، یان خوازەو هونەرە باسکراوەکانیتر بەکاربێنێ، ڕاستیی قسەکانی منی بۆ دەردەکەوێ. بۆنموونە (ئەسخیلوس)و (یۆریپیدیس) هەمان دێری ئەیامبیان نووسیوە، بەڵام بەگۆڕینی یەك تاکە وشە.

(یۆریپیدیس) وشەیەکی ناباوی خستۆتە جێگای وشەیەکی ئاسایی و بەمەوە دێرە نوێکە جوان بووە، کەچی ئەوەی پێشوو سواوە.

(ئەسخیلوس) لەشانۆگەری (فیلۆکتیتیس)[٧] ی خۆیدا نووسیویەتی:

" کێم و زووخاوێك گۆشتی پێم دەخوا"

کەچی یۆریپیدیس وشەی (داوەت)ی لەجیاتی (دەخوا) بەکار هێناوە:

" کێم و زووخاوێك داوەت لەسەر پێم دەکا"

هەروەها لەم دێرەی خوارەوەدا:

" ئەوە منم لەغەرو درێو و بێ کەلکم"

ئەگەر وشەی باو دابنێین دەبێ بە:

" من وردو لاوازو ناشیرینم"

هەروەها ئەم دێرە کەدەڵێ:

" سفرەیەکی سادەی ڕاخست و ئەوەی خوا دابووی هێنای"

ئەگەر وشەکانی بەوشەی باو بگۆڕین، بەم جۆرەی لێ دێ:

" سفرەیەکی بچووکی ڕاخست و خواردنێکی کەمی هێنا"

هەروەها لەم ڕستەیەدا کەدەڵێ:

" کەناری دەریا گرمەی دێ"

بەشێوەی باو بەم جۆرەی لێ دێ:

" کەناری دەریا هاشەی دێ)

ئەریفرادیس[٨] گاڵتە بەتراجیدینووسەکان دەکا، کەدەربڕینی وایان بەکارهێناوە کەس لەقسەی ئاساییدا بەکاریان ناهێنی، وەکوو:

(لەخانووەکان دوور) لەباتی : (دوور لەخانووەکان)

هەروەها : (بۆتۆ دەدا) لەباتی (بەتۆ دەدا)

(منی ئەو) لەباتی ( من هی ئەوم)

( ئەخیل لەبارەی) لەباتی (لەبارەی ئەخیل)

ئیتر شتی وا.

لەڕاستیدا، ئەم جۆرە دەربڕینانە کەزاراوەی ئاسایی نین، بەکارهێنانی زمانی شیعری لەزمانی ئاسایی سواوەوە بەرزتر دەکەنەوە، بەڵام دیارە ئەریفرادیس نەیتوانیوە دەرک بەمە بکات.

شتێکی چاکە ئەگەر بتوانین ئەم هەموو هونەرانە بەچاکی بەکار بێنین کەباسم کرد، وەکوو وشەی لێکدراوو وشەی هاوردەی ناباو، بەڵام لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کەخوازە بەچاکیو بەشارەزایی بکاربێنین. ئەمەش شتێ نییە بتوانین لەخەڵکی ترەوە فێری بین، بەڵکو زادەی بەهرەو توانایەکی سروشتی بەرزە، چونکە دەسەڵات شکان بەسەر بەکارهێنانی خوازەدا، نیشانەی دەسەڵات و دەرک کردنی شتی لەیەکچووە.

لەجۆرەکانی وشە، وشەی لێدراو لەهەموویان زیاتر لەگەڵ (دیتیرامب) دەگونجێ و وشەی خوازراوە ناباویش لەهەموویان گونجاوترە

بۆ شیعری پاڵەوانێتیی و بەکارهێنانی وشەی خوازەیی لەگەڵ شیعری ئەیامبیدا دەگونجێ.

لەڕاستیدا، ئەمانە هەر هەموویان بەرێک و گونجاوی لەشیعری پاڵەوانێتیدا بەکاردێن، بەڵام لەشیعری ئەیامبیدا، کەلەزمانی قسەکردندا بەکاردێ. تەنیا ئەو وشەو زاراوانەی لەگەڵدا دەگونجێ کەلەزمانی قسەکردندابەکاردێ، واتە وشەی باوی ناو خەڵک و خوازەو جوانکاری .

ئیتر ئەوەندە بەسە بۆ باسی تراجیدیی و لاساکردنەوەی بەهۆی کردەوەوە[٩٠].

# بەشی بیستو سێیەم

## شیعری داستانی

بێگومان هونەری لاساکردنەوە کەلەشێوەی گێڕانەوەی شیعریدا[1] بێ، پێویستە چنینەکەی وەکوو چنینی تراجیدی بەشێوەی درامی[2] دابرێژرێ، واتە: دەبێ ناوەراستو کۆتایی هەبێ، بۆئەوەی داستانەکە وەکوو بوونەوەرێکی زیندووی تەواو تامو چێژی دروستو تایبەتی خۆی هەبێ.

داستان نابێ وەکوو ڕەوتی مێژوویی ئاسایی وابێ، مێژوو تەنیا باسی یەك کردەوە ناکا، بەڵکوو باسی سەردەمێكو ئەو هەموو شتانە دەکا کەلەو سەردەمەدا بەسەریەك کەس، یان زیاتر هاتووە و دەشێ ڕووداوەکان پەیوەندیان بەیەکەوە نەبێ. وەکوو ئەوەی کەجەنگی دەریایی سەلامین[3] و پێکداداانی قرتاجییەکان[4] لەسقلیە، لەیەك کاتدا ڕوویان داوە[5]، بەڵام یەك ئامانجی هاوبەش کۆیان ناکاتەوە. هەروەها ئەو زنجیرە ڕووداوەی دەشێ بەدوای یەکدا بێن، بێ ئەوەی یەك ئامانج بەیەکەوە بیانبەستێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، زۆربەی شاعیرەکان ڕێبازی مێژوونووسەکان پەیڕەو دەکەن.

لەم بارەیەوە هۆمیروس، کەگوتم خاوەنی ئیلهامێکی خوداییە، لەهەموو شاعیرەکانی دی باڵا دەستترە. هەرچەندە جەنگی (تەروادە) سەردتاو کۆتایی هەیە، بەڵام ئەم نەیویستووە سەراپای جەنگەکە بخاتە ناو داستانەکەیەوە. ئەگەر وای بکردایە کارەکەی دەبوو بەکارێکی زۆر فراوانو بەیەك جارو بەیەك سەرنج دەرك نەدەکرا، ئەگەر هەوڵیشی بدایە درێژییەکەی لەچوارچێوەیەکی مام ناوەنجی دا بێ، لەبەر جیاوازیی ڕووداوەکان زۆر ئاڵۆز دەبوو. ئەوەی (هۆمیرۆس) کردوویەتی ئەوەیە

کەیــەك بەشــی لەچــیرۆکەکە وەرگرتــووەو چــەند ڕووداوێکــی بــچووکی لەبەشــەکانی‌تر لەگــەڵ پێـشکەش کــردووە، وەکــوو ڕووداوی (کەتــەڵۆگی کەشتییەکان/و ڕووداوی‌تر کەبەمــەوە وای کــردووە داســتانەکە بەشـێوەی جۆراوجۆر خۆی بنوێنێ.

کەچی شاعیرەکانی تر، لەداستانەکانیاندا، باسی تەنیا یەك پاڵەوان، یــان یــەك ســەردەم ؛ یــان یــەك کردوەیــان کــردووە کەلەچــەند ڕووداوێکــی سەربەخۆ پێك دێ. لەو شاعیرانە، بۆنموونە وەکوو دانەری (قوبرسنامە)و دانــەری (ئیلیــادەی بــچکۆڵە) [٦]. بــەم جــۆرە دەتــوانین تــەنیا یــەك دوو تراجیــدی لــە (ئیلیــادە) یــان (ئۆدیــسە) وەربگــرین و چــەند تراجیدییــەك لــە(قوبرســنامە) [٧] وەربگــرین. کەچــی دەشــێ هەشــت تراجیــدی زیــاتر لە(ئیلیادەی بچکۆڵە) وەربگرین کەئەمانەن.

دادوەریــــی چــــەك [٨]، فیلــــۆکتیتیس [٩]، نیوپتۆلیمــــوس [١٠]، یوریپیلــوس [١١]. ئۆدیــسەی دەرۆزەردەکــەر [١٢]. ژنــەکانی لاکۆنیــا [١٣]، تــاڵانی تــەروادە [١٤]. ڕۆیــشتنی کەشــتیگەل [١٥]. جگــە لــەدوو تراجیــدیتر : (سینۆن) [١٦] و (ژنانی تەروادە) [١٧].

# بەشی بیست و چوارەم

## شیعری داستانی

(تەواوکەر)

جگە لەمە، شیعری داستانیش دەبێ دابەشی سەر هەمان جۆرەکانی تراجیدی بکرێ [1]، واتە: سادەو ئاوێتەو ئەوەی پەیوەندی بەکەسێتییەوە هەیەو ئەوەی پەیوەندی بەئازارەوە هەیە. گۆڕانیو دیمەنی شانۆیی لێ دەرچێ [2]، دەبێ بەشە پێکهێنەرەکانی داستانیش وەکوو ئەوانەی تراجیدی وابن، چونکە داستانیش دەبێ (وەرچەرخان) و (ناسینەوە) و رووداوی تراجیدی تێدا بێ. سەرەڕای ئەمە هزرو زمانی شیعری دەبێ زۆر پوختەو پتەو بێ. (هۆمیرۆس) یەکەم کەس بووە ئەم هەموو شتانەی بەکارهێناوەو بەلێزانیش بەکاری هێناون. لەدوو داستانەکەی خۆیدا: (ئیلیادە) پەیوەندی بەئازاری سادەوە هەیەو (ئۆدیسە) پەیوەندی بەکەسێتییەوە هەیەو ئاوێتەیە (چونکە بەدرێژایی داستانەکە دیمەنی ناسینەوەی تێدایە)[3]. جگە لەمانە لەبارەی جۆری هزرو زمانی شیعریدا، لەهەموو داستانەکانی تر تێیانپەڕاندووە.

داستان لەبارەی درێژیو لەبارەی ئەو کێشەی مامەڵەی لەگەڵدا، دەکات لەتراجیدی جیا دەبێتەوە. ئەو درێژییەی پێشتر ئاماژەم پێدا پڕ بەپێستی خۆیەتی، واتە درێژییەکەی ئەوەندە بێ، سەرەتاو کۆتایی بەیەک

سەرنج دەرك بكرێ. ئەمەش ئەو كاتە دەبێ كەلەداستانە كۆنەكان كەوێنە بۆ. بەلام بەقەدەر درێژیی كۆمەڵە تراجیدییەك بێ كەلەیەك ئامەنكا پێشكەش دەكرێن[٤] یەكێ لەسیما تایبەتییەكانی داستان ئەوەیە كەدەشێ درێژ بكرێتەوە. لەتراجیدیدا ناكرێ لاسای چەند بەشێكی چیرۆكەكە بكرێتەوە كەهەموو بەیەكەوە، لەیەك كاتدا، روودەدەن. بەڵام تەنیا لاسای ئەو بەشە دەكرێتەوە، كەئەكتەرەكان بەراستی لەسەر دەپێ شانۆ پێشكەشی دەكەن[٥]. لەلایەكی تریشەوە، شیعری داستانی. كەلەشێوەی گێڕانەوە دایە، دەتوانێ لاسای چەند رووداوێك بكاتەوە كەهەموویان بەیەكەوە لەیەك كاتدا، روودەدەن و ئەگەر بێت و رووداوەكان پەیوەست بن بەبابەتەكەوە سەنگی داستانەكە زیاد دەكەن و سیمای شكۆمەندیی و بایەخی جۆراوجۆری رووداوەكانی پێ دەبەخشن. چونكە یەك ئاهەنگیی، هەر زوو خەڵكەكە وەڕس دەكات و كاریگەری تراجیدی لەسەر شانۆ تێك دەشكێنێ[٦].

بەتاقیكردنەوە دەركەوتووە كەكێشی شەش پێیی پاڵەوانێتی لەگەڵ داستان دا دەگونجێ. هەر كەسێ گێڕانەوەی داستان، بەكێشێكی تری جگە لەمە، یان بەچەند كێشێك بنووسێ، ناكۆكیەكی زەق دروست دەكا. چونكە كێشی شەش پێیی پاڵەوانێتی، لەهەموو كێشەكان سەنگینتر و جێگیرترەو بوارێكی چاك بۆ بەكارهێنانی خوازەو شتی خوازراوەی ناباو دەرەخسێنێ. هەر لەم رووەشەوە شێوەی گێڕانەوەی لاساكردنەوە لەهەموو شتێكی دی باشترە.

كێشی ئەیامبیو تروكی چوار پێیی لەگەڵ دەربڕینی جوولە دەگونجێن. ئەوەی دووەم، واتە تروكی پێوانەی شاییەو ئەوەی یەكەم واتە ئەیامبی بۆ لاساكردنەوەی درامیانەی كردەوە بەكاردێ. جگە لەمە،

لەوەش نابەجێتر ئەوەیە شاعیر چەند کێشێك تێکەڵ بکا، وەکوو (کایریمون) کردوویەتی. بەم جۆرە، هیچ کەسێ بەکێشی پاڵەوانێتی نەبێ، بەهیچ کێشیەکیتر، هەرگیز داستانێکی درێژی نەنووسیوە. هەروەکوو گوتم سرووشت خۆی رێنماییمان دەکا کەکێشی لەبارو گونجاو بۆ بابەتو مەبەستەکانمان هەڵبژێرین.

(هۆمیرۆس) چۆن لەزۆر لایەنی ترەوە بەرزو باڵادەستە، بەتایبەتیش لەم بوارانەی خوارەوەدا بەتوانایە:

(هۆمیرۆس) تاکە شاعیرێکە دەزانێ خۆی دەبێ چ دەورێك لەداستانەکەدا بگێڕێ. لەڕاستیدا، شاعیر پێویستە، تاپێی دەکرێ، کەمتر بەزمانی کەسێتی خۆیەوە بدوێ، چونکە نابێ بەو جۆرە لاسای کردەوەکان بکاتەوە. ئەگەر وابکا نابێ بەلاساییکەرەوە. شاعیرانیتر بەدرێژایی داستانەکانیان کەسێتی خۆیان تێدەخەنو ئەوەی دەینووسن زۆر کەمی لەکەسێتی خۆیانەوە دوورە، بەڵام (هۆمیرۆس) دوای چەند وشەیەکی پێشەکی ، پیاوێ، یان ژنێ. یان کەسێکیتر پێشکەش دەکا. هەریەکە لەمانەش کەسێتی خۆیان و خەسیەتی تایبەتی خۆیان هەیە.

بێگومان تراجیدی دەبێ لاسای (سەرسامی)[٧] بکاتەوە، بەڵام شیعری داستانی. کە کەسەکانی بێئەوەی بیانبینین کردەوەکان ئەنجام دەدەن، لەوانەیە زۆر شتی نەشیاوو ناماقووڵی تێدا بێ کە رەگەزی سەرەکین بۆ ورووژاندنی (سەرسامی) . دیمەنی راونانی (هیکتۆر) [٨]: ئەگەر بخرێتە سەر شانۆ، شتێکی پێکەنیناوی لێ دەردەچێ: یۆنانییەکان لەباتی ئەوەی راوی بنێن، تەنیا لەشوێنی خۆیانەوە وەستاونو (ئەخیل)[٩]یش سەری بادەدا بۆ ئەوەی رایانبگرێ. لەداستانەکەدا ئەم بێهوودەییە لەبەرچاو نییە.

لەڕاستیدا، (سەرسامی) سەرچاوەی تام‌وچێژە، هەروەکوو لەمەدا دەردەکەوێ کەلەکاتی گێڕانەوەی دەنگ‌و باسدا، هەرکەسە لەخۆیەوە شتێکی بۆ زیاد دەکا، چونکە واتێ‌دەگا گوێگرەکان چێژ لەمە وەردەگرن.

(هۆمیروس) پێش هەمو شتێ شاعیرەکانی فێرکردووە شتی ناراست دەبێ چۆن بگوترێ ئاوا بیلێن، وات بەهۆی بکارهێنانی فریودان، یان پێوەری نادروستەوە. ئەگەر شتێ لەئەنجامی شتێکی ترەوە بێ، یان لەبەرئەوە ڕووبدا چونکە ئەوەی‌تر ڕوویداوە، خەڵك وای بۆ دەچێ، کەئەگەر ئەنجامەکە هەبێ، یان ڕووبدا، دیارە ئەوەی پێشەوە هەبووە، یان ڕوویداوە، بەڵام ئەمە وانییە. واتە: ئەگەر گریمانەکە ڕاست نەبێ، بەڵام شتێکی تر هەبێ، کەئەگەر گریمانەکە راست بوایە، دەبوایە ئەمیش ڕاست بێ ، یان ڕووبدا، ئەوسا ئێمە دەبوایە شتەکەی‌تر بەڕاستەقینە دابنێین، چونکە مێشك کەدەزانێ ئەمە ڕاستە، لەوانەیە بەهەڵە واتێ‌بگا گریمانە ئەسڵەکە ڕاست بێ. نموونەیەك بۆ ئەمەیان ڕووداوەکەی (خۆشووشتن)[١٠]ە لە(ئۆدیسە)دا.

شتی ئەستەمی شیاو دەبێ لە شتی شیاوی نائەستەم پەسەند تر بکرێ.نابێ چیرۆکەکە لەڕووداوی ناماقووڵ دروست ببێ.

پێویستە بەپێی توانا هەموو شتێکی ناماقووڵ دووربخرێتەوە، یان بکەوێتە دەرەوەی ڕووداوەکانی سەر شانۆ. بۆنموونە وەکوو (ئۆدیبوس) کەنازانی (لایوس) چۆن مردووە. ئەمەش ناخرێتە ناو شانۆگەرییەوە کەلە (ئیلیکترا)دا [١١] هاتووە تەتەرەکە باسی یارییەکانی (پیتی)[١٢] دەگێڕێتەوە، یان وەکور شانۆگەری (میسییەکان)[١٣] کەپیاوەکە لە(تیگیا)[١٤]وە دەچێتە (میسیا) [١٥]بێ ئەوەی هیچ قسەی لەدەم بێتە دەرەوە. جێی پێکەنینە بڵێین ئەگەر چنین بەم جۆرە نەبێ تێك دەشکێ و لەناو دەچێ.

شاعیر نابێ هەر لەسەرەتاوە ئەم جۆرە چنینە پێشکەش بکا، بەلام ئەگەر شاعیر ئەم جۆر چنینە بەکاربێنێ و بشێ بەشێوەیەکی ماقوولتر پێشکەش بکرێ، ئەو حەلە هەولەکەی بەتەواوی بێ جێیە.

تەنانەت لە(ئۆدیسە)شدا، ئەو ڕووداوەی کەئۆدیسە لە(ئیتاکا) دا دەبرێتە سەر کەنار، ئاشکرایە ئەگەر شاعیرێکی نزم مامەڵەی لەگەڵ کردبا، ڕەگەزە ناماقوولەکانی پەسەند نەدەکرد، کەچی ئەودتا (هۆمیرۆس) توانیویەتی ناماقوول و بێهوودەیی ڕەگەزەکانی داپۆشێ و بەهۆی خەسیەتەکانی‌تر، سیحری جوانی پێ بدا.

زمانی شیعریی پێویستە تەنیا لەبەشە (لاوەکییەکان) بایەخی پێ بدرێ، واتە لەو بەشانەی کەبابەتی هزرو کەسێتی نین، چونکە ئەو زمانە شیعرییەی زۆر ڕازاوە بێ، لەوانەیە هزرو کەسێتی بشارێتەوە.

# بەشی بیستو پێنجەم

## بەرپەرچدانەوەی رەخنەگرانەو وەڵامدانەوەیان

بۆ ئەوەی بیرێکی روونو ئاشکرا لەبارەی بەرپەرچدانەوەی رەخنەگرانەی جۆراوجۆرەوە بەدەست بێنین، واتە لەبارەی ژمارەو سروشتو وەڵامی ئەو رەخنانەوە، پێویستە بەم جۆرەی خوارەوە سەیریان بکەین:

شاعیر وەکوو نیگارکێش و، یان هەر هونەرمەندێکی تر، ئامانجی لاساکردنەوەی ژیانە. پێویستە لەم سێ رێگایە، بەیەکێکیان لاساکردنەوەکە ئەنجام بدا:

- یان لاساکردنەوەی شتەکە چۆنە ئاوا.
- یان لاساکردنەوەی شتەکە وەك دەڵێن چۆنەو وەك دیارە چۆنە،
- یان لاساکردنەوەی شتەکە وەك دەبێ چۆن بێ.

وەسیلەی لاساکردنەوەی شاعیر زمانە، کەبریتییە لەتێکەڵەیەکی گونجاوی وشەو زاراوەی ئاباوو خوازەو دەستکارییەکانی تری زمان، کە رێگەمان داوە شاعیر بەکاریان بێنێ.

دەبێ ئەوەشمان لەبیربێ کەپێوانەی دروستو لەباری شیعر وەکوو پێوانەی بیردۆزی سیاسی، یان هیچ هونەرێکیتر نییە.

لەشیعردا، دوو جۆرە هەڵە هەن: جۆرێکیان بنچینەییەو جۆرەکەی تریان رووکەشە. ئەگەر شاعیر بیەوێ لاسای شتێکی ڕاستەقینەو تایبەتی بکاتەوەو لەبەر کەم شارەزایی بەهەڵەدا بچێ، ئەمە هەڵەیەکی بنچینەییە، بەڵام ئەگەر هەڵەکەی لەو شتەدا بێ کەدەیەوێ لاسای بکاتەوە، بۆ نموونە ئەگەر وێنەی ئەسپێك بکا کەدەستو پێی ڕاستەی بەیەکەوە بۆ پێشەوە باوێ [1]، یان ئەگەر هەڵەکەی لەبوارێکی زانستی تایبەتیدا بێ، وەکوو پزیشکی، یان هەر بابەتێکی تەکنیکی تر، یان ئەگەر وێنەی شتی ئەستەم بکێشێ، لێرەدا هەڵەکەی بنچینەیی نییە.

لە بەرپەرچدانەوەی هەر ڕەخنەیەك دەبێ ئەم خاڵانەمان لەبەر چاو بێ:

بایەکەمجار ئەو گیروگرفتانە وەربگرین کەپەیوەندییان بە بنچینەکانی هونەری شیعرییەوە هەیە. ئەگەر شاعیرەکە نیگاری شتێکی ئەستەم بکێشێ، بەڕاستی بەهەڵەدا چووە، بەڵام پاساوی کارەکەی، ئەو کاتە دەبێ کەکارەکەی ئامانجی دروستی خۆی بپێکێ هەروەکوو باسم کرد. واتە ئەگەر بەمەوە وا بکا فڵانە بەش، یان فیسارە بەشی داستانەکە تاسێنەرو سەرنجکێش بێ، وەکوو ڕاونانی (هیکتۆر)، بەڵام ئەگەر بکرایە ئەم ئامانجە بەشێوەیەکی چاکتر بهاتایە دی، بەرەچاوکردنی پێویستییەکانی هونەر، ئەوسا هەڵەکە پاساودانی بۆ نییە، چونکە پێویستە داستان، بەپێی توانا، بەتەواوی لەهەڵەوە دوور بێ.

دیسان، ئاخۆ لەدوو جۆرەکەی هەڵە، کامەیان بەڕاستی ئەو هەڵەیەیە، کەئێمە مەبەستمانە؟ ئەگەر هەڵەکە پەیوەندی بەبنچینەکانی هونەری شیعرییەوە هەبێ، یان ئەگەر هەر تەنیا شتێکی ڕووکەش بێ؟

ئەگەر نەزانی شووری مێیە شاخی نییە، ئەمە هەڵەکەی لەوە بچوکترە کەوێنەیەکی خراپی بکێشێ لەخۆی نەچێ.

ئینجا وادانێ بابەتێك ئەم رەخنەیەی لێ گیرا کەڕاستو دروست نییە، دەشێ وەڵامەکەی بەم جۆرە بێ کە : نەخێر لێرەدا، شتەکە دەبێ چۆن بێ، وێنەکەی ئاوا کێشراوە، دەق وەکوو (سۆفۆکلیس) کەئەم خەڵکە دەبێ چۆن بێ، بەو جۆرە وێنەیان دەکێشێ، کەچی (یۆریپیدیس) وانەبوو، خەڵکەکە خۆیان چۆن بوون بەو جۆرە وێنەی دەکێشان. ئەگەر وێنە کێشانەکە نەبەپێی ئەم رێبازە بێو نەبەپێی ئەو ڕێبازە، ئەوسا شاعیر دەشێ بەوە بەرپەرچبداتەوە کە ئەم خۆی، وێنەی شتەکان بەو جۆرە دەکێشێ کەخەڵك باسیان دەکا، بۆنموونە وەکوو ئەو چیرۆکانەی لەبارەی خواکانن. ئەم چیرۆکانە بۆی هەیە نەڕاست بێو نە لەڕاستییەوە هاتبن، بەڵکو بەو جۆرە بن کە (زینەفۆنیس)[٢] باسی کردوون (لەگەڵ بۆچوونی خەڵك دەگونجێن).

لەحاڵەتی تردا، بۆی هەیە وەڵامەکە بەم جۆرە بێ، کەوەنەبێ وێنەکە لەڕاستی باشتر بێ، بەڵکو شتەکان چۆنن ئاوها لاسایان دەکاتەوە، بۆ نموونە وەکوو وەسفی ڕمەکان کەدەڵێ:

(( ڕمەکان بەستوونی بنیان لەزەوی بوو و نووکیان روو لەهەوا بوو))
[٣]
چونکە ئەوسا ڕەوشتەکە بەو جۆرە بوو، ئێستاش لەناو (ئیلیری) یەکان هەر وایە.

بۆئەوەی بڕیار بدەین ئاخۆ ئەو شتەی گوتراوە، یان کراوە، لەڕووی ڕەوشتەوە چاکە یان خراپە، نابێ هەر تەنیا چاکەو خراپەی شتەکە لەبەرچاو بگرین، بەڵکو دەبێ ئەوەشمان لەبەرچاو بێ کە کێ قسەکەی کردووەو کارەکەی ئەنجام داوەو بۆ کێی کردووە؟ بەچ بۆنەیەکەوە؟ بەچ

هۆیەکەوە؟ بۆچ مەبەستێك؟ بۆ نموونە، ئایا بۆ ئەوەی بووە چاکەیەکی زۆرتری دەست بکەوێ؟ یان بۆ ئەوەی بووە خۆی لەخراپەیەکی گەورەتر بپارێزێ؟

هەندێ ڕەخنەی تر هەن دەشێ بەلێکدانەوەی زمانی شیعریی وەڵام بدرێنەوە. بۆنموونە، ئەو وشە دەگمەنەی (هۆمیروس) بەکاری هێناوە کەدەڵێ (یەکەم جار ئێسترەکان)، ڕەنگە (هۆمیروس) مەبەستی لەوشەی (ئێستر) پاسەوان بێ نەك ئێستری ڕاستەقینە.

هەروەها کەلەبارەی (دۆلۆن) [٤] دەڵێ (( بەڕاستی ئەدگارێکی دزێوی هەبوو)) لێردا ڕەنگە مەبەستی لەشی ناهەموار نەبێ، بەڵکو مەبەستی ڕووخساری ناشیرینی بێ، چونکە کریتییەکان کەدەڵێن (ئەدگاری جوانە) مەبەستیان ئەوەیە (روخساری جوانە). هەروەها کەدەڵێ: (( شەرابەکە بەتوندی تێکەڵ بکە)) لەوانەیە مەبەستی ئەوەبێ بڵێ : (( شەرابەکە خێراتر تێکەڵ بکە))، نەك مەبەستی شەرابی خوڕو (تێکەڵ نەکراو) بێ وەکوو لای سەرخۆشەکان.

هەندێ دەربڕینی تر هەن خوازەیین. بۆ نموونە (هۆمیروس) کەدەڵێ: (( هەموو خواکان و هەموو جەنگاوەرەکان بەدرێژایی شەو نووستن)) ئەوەشمان لەبیر بێ لەهەمان کاتدا دەڵێ: (( کەچاوی بەدەشتی تەروادەدا گێڕاو گوێی لەدەنگی نای و کەڕەنا بوو، تاس بردییەوە))

لێرەدا وشەی (هەموو)، بەشێوەی خوازەیی، لەجیاتی وشەی زۆر بەکار هاتووە، چونکە (هەموو) جۆرێکە لە (زۆر). هەروەها کەدەڵێ: ((تەنیا ئەو بەشی نەبوو..)) ئەمەش خوازەیە، چونکە وشەی (تەنیا)ی بەس بۆ ئەوە بەکارهێناوە کەلەوانی دی ناسراوترە.

یان بۆی هەیە لێکدانەوەی گیروگرفتەکە لەمەسەلەی خوێندنەوەی وشەدابێ. وەکوو دەستکارییەکانی (هیپیاس) [٥]ی خەڵکی (تاسۆس) کەدەڵێ : (( پێشی دەبەخشین)) و (( بەشێکی لەبەر باران دەڕزێ))

یان لەبارەی کۆمەڵە وشەوە بێ وەکوو (ئیمپیدۆکلیس) دەڵێ: ((هەر زوو بوون بەمردەنی، کەچی پێشتر جاویدان بوون، ساف بوون پێشتر بوون بەتێکەڵە)).

یان بۆی هەیە لێڵی تێدا هەبێ، واتە وشەکان دوو مانا هەڵبگرن، بۆنموونە وەکوو : (( شەو دوو سێیەکی زیاتر ڕۆیشتبوو، بەلام سێیەکێکی هێشتا مابوو. )) لێرەدا لێڵی لەوشەی (زیاتر) دایە.

یان، دواجار بەهۆی بەکارهێنانی ئاسایی زمانەوە بێ، بۆ نموونە وەکوو : ( شەرابی تێکەڵ بەئاو) هەر پێی دەگوترێ شەراب. هەروەها دەستەواژەیەکی وەکوو (( پووزەوانەی لەتەنەکەی تازە ساو)). یان ئەو کەسانەی کاری جۆرەها ئاسن دەکەن، پێیان دەگوترێ (ئاسنگەر). هەروەها ئەوەش کە (گانیمیدی)[٦] شەراب بۆ زیوس تێدەکا. هەرچەندە کەخواکان شەراب ناخۆنەوە، بەلام ئەمە دەشێ بەهۆی بەکارهێنانی خوازەیی لێك بدرێتەوە.

هەرکاتێ وشەیەك هەبێ، جۆرە ناکۆکییەکی لەمانادا هەبێ، دەبێ بزانین لەو ڕەوتەدا کەبەکارهاتووە چەند جۆرە لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێ – بۆ نموونە، لە(( ئەو ڕمە برۆنزییەی لەوێ ڕاگیرا))، (لەوێ ڕاگیرا) بەچەند جۆرێك لێك دەدرێتەوە.

پێویستە بیر بکەینەوە چۆن بەباشترین شێوە خۆمان لەو هەڵەیە دوور بخەینەوە کە (گلۆکۆن) [٧] باسی دەکا، کەدەڵێ : ڕەخنەگرەکان پێشەکی گریمانە دەکەن و ئینجا لەسەر ئەم بنچینەیەوە دژی شاعیرەکان

شت ئەنجام دەدەن. جا ئەگەر وشەکانی شاعیرەکە بەڕاستی لەگەڵ ئەو ئەنجامەی ئەوان بەو جۆرە پێی گەیشتوون، ناکۆک بێ، ئەوان ڕەخنەی لێ دەگرن، وەکوو ئەوەی شاعیرەکە هەر بەڕاستی ئەوەی گوتبێ کە (ئەوان بۆیان هەڵبەستووە. ئەمە وەکوو بەسەرهاتی (ئیکاریوس) [8] وایە.

هەندێ ڕەخنەگر ڕایان وایە (ئیکاریوس) ئەسپارتەیی بووە، بۆیە پێیان سەیرە کە (تیلیماکوس)[9] چۆتە ئەسپارتە بۆ ئەوەی بەدوای دا بگەڕێ، چۆن تووشی نەهاتووە. بەلام بۆی هەیە مەسەلەکە بەڕاستی ئەوە بێ کە (کیفالینی)[10] یەکان دەڵێن (ئۆدیسە) لەولاتی ئەمان ژنی هێناوەو خەزووری ناوی (ئیکادیوس) بووە، نەك (ئیکاریوس). ئیدی لەوانەیە بەهۆی هەڵەیەکەوە ئەم جۆرە گیرو گرفتە سەری هەڵدابێ.

کەواتە، بەشێوەیەکی گشتی، شتی (ئەستەم) دەبێ بەمانە پاساو بدرێتەوە:

- یان بەکاریگەریی شیعریی
- یان بەهەوڵ دان بۆ گەشەپێدانی واقیعو
- یا بەپەسەندکردنی بیروڕای باوی ناو خەڵك.

بەش بەحاڵی کاریگەریی شیعریی، شتێکی (ئەستەم)، کەقەناعەتت پێ بێنێ، لەشتێکی (شیاو) پەسەندترە، کەنەتوانێ قەناعەتت پێ بێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەستەمە، کەسانی وا هەبن کە (زیوکسیس) وێنەی دەکێشان، سەرەڕای ئەمەش وا چاکە نموونەی باشی لەهەموو شتێ تێ بپەڕێنێ.

بۆی هەیە پەسەندکردنی بیروڕای باوی ناو خەڵك ببێ بەپاساو بۆ شتی ناماقووڵ، وەکوو هەندێ جاری وا هەیە شتەکە خۆی لەخۆیەوە ناماقووڵ نییە، چونکە زۆ نزیکە شتەکە بەپێچەوانەی شیانەوە ڕووبدات.

پێویسته وەکوو بەرپەرچدانەوەی ڕێبازی دیالێکتیکی، لەناکۆکی قسە بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بزانین داخۆ شاعیرەکە مەبەستی هەمان شتو هەمان پەیوەندیو هەمان بابەتو بایەخە کەتۆ مەبەستتە، پێش ئەوەی کە سەرزەنشتی بکەی کە، لەگەڵ قسەی خۆی، یان لەگەڵ ئەوەی پیاوی ژیر بەڕاستی دەزانێ، ناکۆکە.

ناماقووڵیو پەستیی، ئەو کاتە دەبن بەمایەی ڕەخنە، کەهونەرەکە پێویستی پێ نەبنو بەچاکیش بەکار نەهێنرێن، وەکوو کەناماقووڵیی لای (یۆریپیدیس) بەچاکی بەکار نەهاتووە، کەلەشانۆگەری (میدیا) دا، (ئیگویس)[11] پێشکەش دەکا، یان وەکوو پەستو نزمیی (مینلاوس) لەشانۆگەری (ئۆرێستێس) دا.

کەواتە ئەو ڕەخنانەی لەهەر بەرهەمێك دەگیرێن بۆ پێنج سەرچاوە دەگەڕێنەوە، شتەکە بۆی هەیە:

ئەستەم بێ، یان ناماقوول بێ، یان سەرچاوەی بەدڕەوشتی بێ، یان ناکۆکیی تێدابێ، یان هەڵەی هونەری تێدابێ.

وەلامەکانیش دەبێ لەبەر ڕۆشنایی ئەو دوازدە پێوەرەی ژماردمن لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ[12].

## بەشی بیستو شەشەم

## بەراوردکردنی داستانو تراجیدی

لەوانەیە ئەم پرسیارە خۆی ڕەپێش بکا: ئایا لەدوو شێوەکەی لاساکردنەوە کامەیان پەسەندترە داستان، یان تراجیدی؟ ئەگەر شێوەی هەرە باش ئەوەبێ کەکەمتر سواوو بازاڕی بێ، ئەوەی کەمتریش سواوو بازاڕی بێ هەمیشە جۆرە خوێنەرێکی باشتر بۆخۆی ڕابکێشێ، ئیتر لەمەوە دەردەکەوێ کە ئەو شێوەی سەرنجی هەموو کەس بۆخۆی ڕابکێشێ، دەبێ تەواو سواوو بازاڕی بێ.

ئەکتەرەکان وا تێدەگەن، ئەگەر لەکاتی یاری کردنی دەورەکەیاندا لەخۆیانەوە شت زیاد نەکەن، ڕەشەوەندی خەڵك ناتوانن لەقسەکانیان بگەن، بۆیە زۆر جوولانەوەی ناپێویست لەسەر دەپی شانۆ دەکەن. بۆ نموونە نەیژەنەکان، ئەگەر بیانەوێ لاسای فڕێدانی خەپڵە (قورص) بکەنەوە، خۆیان لەگەڵ تێ هەڵدەدەنو ئەگەر (سکیللا) [1] پێشکەش بکەن سەرکردەی کۆرسەکەیان ڕادەکێشن.

کەواتە تراجیدیش ئەو ناتەواییانەی هەیە، کەئەکتەرە کۆنەکان لەوانەی دوای خۆیان وەریان گرتووە. ئەوەتا (مینیسیکوس)[2] بە(کاللیبیدیس)[3]ی دەگوت : ( مەیموون)، چونکە لەکاتی یاریکردنی دەوری خۆیا زۆر بەخراپی زیدەڕۆیی لەجوولانەوەدا دەکرد. ئەم قسەیە بە (پنداروس) [4] یش گوتراوە.

بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندی هونەری تراجیدی بەداستانەوە، وەکوو پەیوەندی ئەم ئەکتەرە تازانە وایە بەوانەی پێشووەوە. بەم جۆرە دەڵێن داستان سەرنجی خوێنەری بەرزو ڕۆشنبیر ڕادەکێشێ کەپێویستی بەهاوکاری دیمەنی بەرچاو نییە، کەچی تراجیدی سەرنجی کەسانی نزمتر ڕادەکێشێ. بۆیە ئەگەر تراجیدی هونەری پەستو سواو بێ، دیارە لەداستان پەستو نزمترە.

ئەم جۆرە گەنگەشەیە، بەپلە یەك، بریتییە لەڕەخنەی دەور گێڕانی سەر شانۆ، نەك ڕەخنەی شیعر، چونکە دەشێ شاعیریش لەکاتی خوێندنەوەی شیعردا زێدەڕەوی لەجوولانەوە بکات. وەکوو (سۆسیتراتوس) [٥] وای دەکرد: بەش بەحاڵی سترانبێژیش مەسەلەکە هەروایە، وەکوو (مناسیتوس)[٦]ی خەڵکی (ئۆپونتی)[٧].

بێگومان مەرج نییە هەموو جۆرە جوولانەوەیەك نا پەسەند بێ. ئەگەر وابوایە سەما دەبوو بەجێی ڕەخنە. بەڵکو ئەو جوولانەوەیە ناپەسەندە، کەئەکتەری پەستو نزم دەیکا. (کالليپيديس) ئەو ڕەخنەیەی لێ دەگیرا کەئەمڕۆ ناراستەی هەندێ ئەکتەری نوێ دەکرێ، کەناتوانن دەوری ژنی بەڕێزو بە رووەت بگێڕن.

شتێکی تریش هەیە، تراجیدیش بۆی هەیە کتو مت وەکوو داستان ئەرکی تایبەتی خۆی بەبێ جوولەو کردەوە ئەنجام بدا، چونکە دەکرێ هەر تەنیا بەخوێندنەوە لەبەهای شانۆگەرییەکە بگەین. جا تراجیدی لەهەموو لایەنەکانیتر، لەداستان بەرزو بالاترە، چونکە ئەو کەموکورتییانەی باسمان کردن بەشێکی ڕەسەن نین تیا.

تراجیدی بەپلە دوو، هەرچی لەداستاندا هەبێ، تێیدا هەیەو تەنانەت دەتوانێ کێشی داستانیش بەکار بێنێ. جگە لەمە، تراجیدی

کاریگـەری دیمـەن و مۆسـیقای تێدایـە، ئەمانـەش زیـادەی گـرنگن و گەورەترین چێژ دەستەبەر دەکەن. کاریگەری تراجیدی ئەوەندە گەورەیە کەدەخوێنرێتـەوە وەکـوو ئـەوە وایـە لەسـەر شـانۆ پێـشکەش بکـرێ. سـەرەڕای ئەمـەش لاسـاکردنەوەی تراجیـدی بەمەودایـەکی کـەمتر ئامانجەکانی خۆی دەستەبەر دەکا. ئەو شتەی کورت و خەستتر بێ، زیاتر چێژ دەبەخشێ لەو شتەی بۆ مەودایەکی زۆر درێژ دەبێتەوە. بۆ نموونە، تۆ (ئۆدیبـوس) ی (سـۆفۆکلیس) بێنـە بەرچـاو. ئەگـەر درێـژ بکرایـەوەو دێرەکانی بەقەد دێرەکانی (ئیلیادە) بوایە، ئاخۆ کاریگەری چۆن دەبوو؟

هـەروەها لاسـاکردنەوەی داسـتان (یـەکێتی) کـەمتر تێدایـە. ئەمـە لەوەدا دەردەکەوێ کەهەر داستانێك بگری کەرەستەی چەندین تراجیدی لەخۆ گرتووە. ئەگەر شاعیری داستان مامەڵە تەنیا لەگەڵ تاکە چیرۆکێك بکا، لەو حاڵەتەدا، یان بەپچڕاوی دەردەکەوێ، ئەگەر بەکورتی پێشکەش بکرێ و، یـان تووشـی پووچـی و داڕووخـان دەبـێ، ئەگـەر درێژییەکـەی بەپێی دەستووری درێـژیی داسـتان بـێ. مەبەسـتم لێرەدا، ئـەو داستانەیە کەچەندین کردەوەی تێدایە، وەکوو (ئیلیادە)و (ئۆدیسە) کەهەر یەکە زۆر بەشـەو هـەر بەشـێك درێـژیی تایبـەتی خـۆی هەیـە. ئـەم دوو داسـتانە تـا ئەوپەڕی بەتۆکمەیی داڕژاون، بەجۆرێ هەریەکەیان لاسای تەنیا یـەك تاکە کردەوە دەکاتەوە.

کەواتە، ئەگەر تراجیدی لەم هـەموو لایەنانەوە لەداستان باڵاتربێ – جگە لەوەی کەئەرکی هونەریی خۆی جێبەجێ دەکا، چونکە ئـەم هونـەرە شیعرییانە نـابی هـەر چێژێکی هـەبێ پێمـان ببەخشن، بـەڵکو دەبـێ ئـەو جۆرە چێژەمان پـێ ببەخشن کەباسم کـرد، ئاشکرایە کەتراجیـدی دەبـێ

شێوەیەکی هونەری هەرە بەرز بێ، چونکە لەداستان باشتر ئامانجەکانی دەپێکێ[8].

ئێستا ئەوەندە بەسە کەلەبارەی تراجیدی و داستان بەگشتیو جۆرەکانیانو ژمارەی بەشە بنچینەییەکانیانو سروشتی هەر یەکێکیانو هۆی سەرکەوتنو سەرنەکەوتنیانو ئەو ڕەخنانەی لێیان دەگیرێو چۆنیەتی وەڵامدانەوەیان، باسم کرد[9].

*****************************************

# پەراوێزەکانی پێشەکی

١-کتێبەکەی ئەرەستۆ لە بنەڕەتدا ناوی (Depoetica-لەبارەی هونەری شیعرەوە)یە.ئەم ناونیشانە زۆرجار هەر بە (پۆیەتیکاPoetica) یان (هونەری شیعر) و یان (شیعر ناسی) هاتووە. ئەم کتێبە یەکێکە لە دوو کتێبی ئەرەستۆ کە لەبارەی شیعرو گوتارو هونەری نووسین و ئاخاوتن و زمانەوانی نووسیویەتی، واتە: (پۆیەتیکا)و (ریتۆریکا). ئەم دوو کتێبە بەلای ئەرەستۆ خۆیەوە زانستی بەرهەم هێنانن و مەبەست لەم دوو زانستە یارمەتی دانی پێگەیاندنی شاعیری چاکە.

٢-جۆرەکانی شیعر لای ئەرەستۆ ئەمانەن: شیعری داستانی و شیعری تراجیدی و شیعری کۆمیدی، ڕەنگە ئەرەستۆ بۆیە باسی شیعری لیریکی نەکردبێ، چونکە شیعری لیریکی لە هونەری مۆسیقاوە نزیکەو ئیتر بە جۆرە شیعرێکی سەربەخۆی دانەناوە.

٣-واتە کاریگەری دەروونی هەریەکێکیان لە گوێگر. ئەرکی هەریەکێکیان ئەو کاریگەرەیە کە جێی دەهێڵێ. بۆ نموونە وەکو کاریگەری تراجیدی کە بریتییە لە (پاك كردنەوە-کاتارسیس).

٤-چنین (Plot): ئەمە بە چیرۆك و ئەفسانە (Methos)و مەسەل وەرگێڕاوە، چنین بریتییە لە بابەت و بنچینەی شیعر، بۆیە لە هونەری شیعردا بایەخێکی تایبەتی هەیە، هونەری شیعر بەبێ ئەم چنینە نابێ.

٥-ژمارەی بەشەکانی شیعر بەپێی ڕەگەز پێکهێنەرەکان و ئەو بەشانەی لێیان پێك دێ دیاری دەکرێت.

٦-لۆجیك وا دەخوازێ لە گشتییەوە بۆ تایبەتیو لە ڕەگەزەوە بۆ جۆرەکانی بچین. هەر بەپێی ئەم بۆچوونەیە ئەرەستۆ بە بنەما گشتیەکانی شیعر دەست پێدەکا کەشتێکی گشتییە.

٧-وەرگێڕی ئینگلیزی بەزۆری لەباتی وشەی (imitation-لاسایی‌کردنەوە)، وشەی (representation-نواندن)ی بەکارهێناوە، بەلاّم لەبەرئەوەی بیردۆزەکە لای ئەفلاتوونو ئەرەستۆ هەر بە بیردۆزی لاسایی کردنەوە هاتووە، لە کوردیدا هەر زاراوەی (لاسایی کردنەوە)مان پەسەند کرد.

٨-داستان (Epic) یان (Epopeia) لە (Epos-ئیپۆس)ی یۆنانیەوە هاتووە کە مانای : قسە، گۆرانی، چیرۆك....دەدات.

داستان بریتیە لە چیرۆکێکی شیعریی درێژ کە باسی پالّەوانێتی نەتەوایەتی دەکاتو ڕووداوەکانی لە ڕاستیو خەیالّەوە ئاوێتەن.کەسەکانی ناو داستان، لەبارەی لەشو ئاوەزەوە لەکەسانی ئاسایی جیان، لەوان بەرزترن. زۆرجار پالّەوانەکان لەگەلّ خوداکان دەکەونە زۆرانبازی.داستان ئەفسانەو هەقایەتی میللیو شارستانێتی نەتەوایەتیو مێژووی دێرینو شەڕوشۆڕو دابو نەریتو گیروگرفتو بیروباوەری سروشتیو ئەودیو سروشتی تێدایە، داستان پانتاییەکی فراوان دادەگرێو کەشو سەقایەتی تراجیدی هەیە، بەشێوازێکی بەرزی شیعریی دادەڕێژێو خەیالّێکی فراوانی تێدایە، بەگشتی دووجۆرە داستان هەن:

-داستانی سەرەتایی، بەداستانی زارەکیش ناسراوە.

-داستانی ئەدەبی، یان داستانی نوسراو.

جۆری یەکەم: کە داستانی سەرەتاییە، سەرەتا بەزار دەهۆنرایەوەو زار بەزار خەڵك بۆ یەکتریان دەگێڕایەوەو لە یەکتر فێردەبوون، پاش ماوەیەکی زۆر ئینجا ئەم جۆرە داستانە وای لێهات بنووسرێتەوە، کەچی جۆری دووەم، واتە داستانی ئەدەبی ئەوەیە کە بە نووسین دەستی پێکردووە.

نموونەی جۆری یەکەم وەکو (گلگامێش)و (ئیلیادە) و (ئۆدیسە)...

نموونەی جۆری دووەم وەکو (ئەنیادە)ی ڤرجیلو (فارسالیا)ی لوکانو (بەهەشتی ونبوو)ی میلتۆنو ...

کۆنترین داستانی یۆنانی دوو داستانە بەناوبانگەکەی هۆمیروسەو پێش هۆمیروس تا ئێستا هیچ داستانێك دیار نییە. کۆمەڵە گرانیبێژێك ئەم دوو داستانەی هۆمیروسیان لەبەربووو لەکۆڕوکۆبونەوەکاندا بەئاوازو گۆرانی دەیانگێڕانەوە ئەمانە پێیان دەگوترا نەوەکانی هۆمیروس یان مالباتی هۆمیروس.ئەم گەڕانو گێڕانەوەی هەقایەتو گۆرانی گوتنەی دوو داستانەکە پێش هۆمیروس هەبووە، بەڵام نەکەوتۆتە قاڵبی داستان.

٩- تراجیدی: وشەیەکی یۆنانییە، لە دووپارچە پێك دێتو مانای (گۆرانی بزن) دەدات. یەکەم جار بریتیبوو لەدابێکی قوربانی کردن کە بەدەم گۆرانی کۆرسەوە لە شەرافەتی (دیۆنیسوس)ی خوای پیتو ڕەزو شەراب پێشکەش دەکرا. لەسەرەتای سەدەی (٥)ی پ.ز، تراجیدی بەشێکی گرنگی ئاهەنگی جەژنی دیونیزیای مەزن بوو لەئاتین. ئەم ئاهەنگانە دوو جۆرن: (ئاهەنگی دیونیسوسی لادێیی)و (ئاهەنگی دیۆنیسوسی شار).

( ئاهەنگی لادێیی) ساڵی دووجار دەکرا: لە مانگی پۆزیدۆن (کانوونی یەکەم-کانوونی دووەم)و مانگی گامیلیۆن (کانوونی دووەم-شوبات).

(ئاهەنگی شار)یش لەمانگی ئیلاتیبۆلیۆن (ئازار-نیسان) دەکرا .

لەم جۆرە ئاهەنگەدا سێ شاعیر بەشداری پێشبڕکێیان دەکرد.هەریەکە سێ تراجیدیو دراماییەکی ساتیری پێشکەش دەکرد.

یەکەمجار هەر تەنیا کۆرس شانۆگەری پێشکەش دەکرد، پاشان سەرکردەیەك بۆ کۆرسەکە دیاریکراو دوای ئەمە (تیسپیس) بۆ یەکەم جار ئەکتەرێکی بردە سەر شانۆ، ئینجا ئەسخیلوس کردی بە دوو ئەکتەر. واتە تراجیدی خستە قالبی دیالۆگ کە پێش ئەو هەر لە قالبی (مۆنۆلۆگ)دا بوو، ئەم داهێنانەی ئەسخیلوس لە بواری شانۆدا وای کرد ئەسخیلوس بەباوکی تراجیدی دابنێن.

(سۆفۆکلیس) یش ئەکتەری سێیەمی بردە سەر شانۆ، بەمەوە وردە وردە دەوری کۆرس لەسەر حسابی زیادبوونی دەوری ئەکتەرەکانو گفتوگۆی نێوانیان، کەم بووەوە. ئەسخیلوسو سۆفۆکلیسو یۆریپیدس سێ تراجیدینووسی هەرە گەورەو پایەداری یۆنانن.

تراجیدی درامایەکە مامەڵە لەگەڵ بەختەوەریو بەدبەختیوکارەساتێك دەکات کەبەسەر پیاوی ناودارو بەدەسەلاتو پلەوپایە دێ.بۆ نموونە وەکو ئۆدیپوسو ئەگامەمنوونو ئەنتیگۆنەو هێکوباو ئەنتۆنیۆو کلیۆپاترەو...ئەو کەسەی تراجیدییەکەی بەسەردێ تا گەورەو مەزنتربێ تراجیدیەکە توندوتیژتر تره. بەلای ئەرەستۆوە لەبەرئەوەی تراجیدی (ترس)و (بەزەیی) لای تەماشاکەران دەبزوێنێ، دەبێ بەهۆی (پاکبوونەوە-کاتارسیس) لەم دوو سۆزە. ئەمە تەماشاکەران دەخاتە بارێکی نیگەرانی، ترسەکە وایان لێدەکا لە دیمەنەکە دووربکەونەوەو (بەزەیی)ش وایان لێدەکا بەرەو دیمەنەکە بکشێن، ئەم هەستی دوورکەوتنەوەو نزیکبوونەوەیە حاڵەتێکی هاوسەنگی دەروونیان لەلا دروست دەکا کە بەردەوام بوونە لەگەڵ ڕووداوەکانی تراجیدییەکە.

١٠-كۆمیدی لە (کۆمۆس)ی یۆنانییەوە هاتووە کە بەمانای (چێژوەرگرتن و ڕابواردن) دێ. کۆمیدی زۆر جۆری جیا جیای هەیە. لە وڵاتی یۆناندا، بەپێی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی مێژوویی، سێ جۆرە کۆمیدی هەبوو: کۆمیدی کۆن و کۆمیدی ناوەڕاست و کۆمیدی نوێ. کۆمیدی یۆنانی سەرەتا پەیوەندی بەدابی پیتاندن و پەرستنی دیۆنیسوسەوە هەبوو.(ئەرەستۆفانیس) ناودارترین نووسەری کۆمیدی یۆنانییە، زۆر کۆمیدی جۆراوجۆری نووسیوە. هەرە دیارەکەیان (بۆق)و (هەورە) کە یەکەمیان ڕەخنەی ئەدەبی و بیروباوەڕەو دووەمیان ڕەخنەی فەلسەفییە.دوای ئەرەستۆفایش،(پلاوتوس)ی ڕۆمانی نووسەرێکی زۆر بەناوبانگی کۆمیدییە.

لەسەدەی (٥)ی پ.ز دوو جۆرە کۆمیدی باوی هەبوو:

ا ـ کۆمیدی سەقلیەیی، ئەمەیان لە سەقلیەو لەسەر دەستی ئەپیکاروس سەری هەڵدا. بەزاری (دۆری) دەنوسرا، کۆرسی تێدانەبوو و بابەتەکانی بەدەوری شتی گشتیدا دەسووڕانەوە، بەڵام داشۆرینی کەسێتی و گاڵتەجاڕی و سیاسی تێدانەبوو.

ب ـ کۆمیدی ئەتیکی:ئەم جۆرەیان لە کۆمیدی سەقلیەیی گرنگترە، ئەمە کۆرسی تێدابوو، دەوری کۆرسەکە لە دەوری ئەکتەرەکان کەمتر نەبوو. دەوڵەتی ئاسین، ساڵی ٤٨٦ پ.ز، بۆ جاری یەکەم دانی بەم جۆرە کۆمیدیە دانا. گرنگترین کۆمیدی ئەتیکی کۆمیدیاکانی ئەرەستوفانسیە.

کۆمیدی، کێشی پاڵەوانێتی (ئەناپیست و ئەیامب وترۆکی)و هی تری تێدا بەکاردەهات. کۆمیدی هەمیشە کۆتایی بە خۆشی و چەژن و ئاهەنگ دەهات.

١١-دیترامب: پارچە شیعرێکی ئاینی سەماو هەڵپەڕکێبوو کۆرسێکی (٥٠)کەسی پێستەی بزنیان لەسەرخۆیان هەڵدەکێشاو لەدەوری کوژگای دیونیسوسی خوای ڕەزو شەرابو پیتوبەرەکەت پێشکەشیان دەکرد.ئەم هونەرە شیعرییە سەرەتا سادەبوو؛ وردە وردە گەشەی سەندو پێشکەوت تا لە دەوروبەری ساڵی (٦٠٠)ی پ.ز بوو بەهونەرێکی سەربەخۆو (ئاریۆن)ی (کۆرنتی) دەستوری تایبەتی بۆ داڕشت.

وشەی (دیترامب) ئەسلەکەی دیار نییە، بەڵام بەزۆری وا دەردەکەوێ یۆنانی نەبێ. ئەم وشەیە یەکەم جار لای (ئەرکیلۆکوس) هاتووە، پاشان (لاسۆس)ی هرمیۆنی بردی بۆ ئاتێنو هەر زوو بوو بە مایەی پێشبڕکێی شاعیرەکان لە ئاهەنگەکانی دیۆنیسوسدا.دەڵێن یەکەم کەس لەم پێشبڕکێیانە پلەی یەکەمی بەدەست هێنا (هیپۆدیکوس)ی خەڵکی (کالکی)بوو، ئەم پێشبڕکێیانە هەر لە برەودابوون تا دەوری ساڵی (٤٧٠)ی پ.ز کە (سیمونیدیس) (٥٦) خەڵاتی پێوەرگرت.

سیمونیدیسو پندارو باکیلیدیس لە شاعیرە ناودارە بەشداربووەکانی ئەم پێشبڕکێیانە بوون، لە دەوری ساڵی (٤٧٠)ی پ.ز، میلانیپیدیسو کینیسیاسو فیلۆکسینوسو تیمۆتیس ڕێرەوی دیترامبیان بەرەو مۆسیقا وەچەرخاند، دیترامب بەدرێژایی سەدەی چوارەمی پ.ز هەر لەبرەودا بوو؛ بەڵام دوای ئەو سەدەیە وردە وردە بایەخی کەم بووەوە.

١٢-ئەمانە دوو ئامێری مۆسیقین، بەڵام لەبەرئەوەی بەشداری لە هەندێ شیعری دیترامبی دەکەن، دەکرێ بخرێنە خانەی بابەتی شیعرەوە، لە کتێبی (کۆمار)و کتێبی (میوانداری)ی ئەفلاتوونیش مۆسیقا دەکەوێتە ناو خانەی شیعرەوە، جێی سەرنجە کە (نای) لەگەڵ دیترامبو چەنگ لەگەڵ نۆمۆس لێدەدرا.

١٢-واته جیاوازیی جۆرەکانی شیعر، لەم شتانەدایە:

ا - جیاوازی وەسیلە.

ب - جیاوازیی بابەت.

ج - جیاوازیی ڕێگاو شێواز، یان چۆنیەتی لاسایی‌کردنەوە.

ئەم جۆرە جیاکردنەوەیە لە (کۆمار)و (ئەکراتیلوس)و (گۆرگیاس)ی ئەفلاتوونیشدا نموونەی هەیە.

# پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

١- بە لای ئەرەستۆوە هونەری نیگارینی وەکوو نگارکێشان و پەیکەرتاشی بە هۆی وەسیلەوە لە یەك جیادەبنەوە .. جۆرەکانی شیعریش بە پێی وەسیلە دەگۆڕێ . لە هەموو هونەرەکان دا، لاسایی کردنەوە رەگەزی هەرە بنچینەییە، تەنانەت بەش بە حاڵی ئەو هونەرانەش کە ناکەونە بەر پێناسەی شیعر ..

ئەرەستۆ بایەخی زۆری بە کەرەستەی هونەری داوە، چونکە کەرەستەکە جۆری هونەرەکە دەست نیشان دەکات . بۆی هەیە هونەری جیا ماحەلِە لەگەڵ یەك بابەت بکەن، بەڵام لە بارەی کەرەستەکەیانەوە ( هۆو وەسیلە ) لە یەك جیا دەبنەوە . کەرەستە دوو جۆرە ..

أ- ئەوەی بە چاو دەبینرێ وەك نیگارکێشان و پەیکەرتاشی و بیناسازی .

ب - ئەوەی بە گوێ دەبیسترێ. ئەمە سێ جۆرە: کێش و ریتم و زمان . ئەمانە یان بە جیاجیاو یان بە سەر یەکەوە کەرەستەی هونەر پێك دێنن:

+ شیعر : زمان و کێش و ئیقاعە.
+ سەما : تەنیا کێشە .
+ مۆسیقا : کێش و ئیقاعە
+ شیعری داستانی و لاواندنەوە : زمان و کێشە
+ شیعری گۆرانی : زمان و کێش و ئیقاعە.

+ شیعری تراجیدی و کۆمیدی : زمان و کێش وئیقاع و مۆسیقایە.
لە گفتۆگۆی نێوان ئەکتەرەکان، تەنیا زمان وکێش بە کار دێت، کەچی لە سروودی بە کۆمەڵ، زمان و کێش و ئیقاعی مۆسیقا بە کاردێ.
کەرەستەی پەخشان تەنیا زمانە ..
واتە کەرەستەی هونەری بریتییە لە :
+ وشەی شاعیر
+ ڕەنگی نیگارکێش
+ دەنگی مۆسیقا
٢- واتە بە هۆی مۆسیقاوە، چونکە دەنگ کەرەستەی مۆسیقایە.
٣- ئیقاع و زمانی مۆسیقا : ئەمانە سێ کەرەستەی دروستکردنی شیعرن , بەڵام لە هونەری تریش بە کاردێن.
٤- مەبەست لە ئامێری فوو : دووزەلەو فرەزەلەو شتی وایە کە بە (syrinx) و(pan-pipe) ناسراون .
٥- هەندێ لە وەرگێڕی زمانە جیاجیا کان لە جیاتی هەست و سۆز و (انفعال ) بارو دۆخیان بۆ داناوە .
٦-ئەوسا لە زمانی یونانیدا وشەیەکی گشتی بەرامبەر ( ئەدەب ) نەبووە بەو چەمك و بۆچوونەی ئەمڕۆ هەیەتی.
٧-( میمۆس ) دیمەنی بەزم و رابواردنە .. جۆرە نواندێك بووە لاسای ژیانی ڕۆژانەی ڕەشەوەندی خەڵکی کردۆتەوە، بە تایبەتی دەنگ و ئاوازی بوونەوەرەکان . ئەم کارە کەجۆرە کۆمیدییەکی ڕەشۆکی بووە . یەکێ بووە لە هونەرەکانی ئەو ڕۆژە . ( سۆفرۆن و زینارکۆس ) ئەم هونەرەیان پێگەیاندوە .

٨-( سۆفرۆن ) ( ٤٧٠-٤٠٠ ) نووسەرێکی میمۆس بوو . بەزاری (دۆری) دەینووسی و دیمەنەکانی بە پەخشانی کێشدار بوون . بابەتی نووسینەکانی لە ژیانی رۆژانەی خەڵك وەردەگرت . ئەفلاتوون زۆر بە دڵی بووە.

٩- ( زینارکۆس ) هەندێ دەڵێن کوڕی ( سۆفرۆن ) بووە، بەلام ژیان و سەردەمی زۆر روون نییە . چەند دیمەنێکی بە زم و رابواردنی نووسیوە .

١٠-گفتۆگۆکانی سوکرات: مەبەست لە گفتۆگۆکانی شاگردەکانی سۆکراتە . وەکوو گفتۆگۆکانی ئەفلاتوون و گفتۆگۆکانی ئەسکەندەری تیوسی. ئەرەستۆ ئەم گفتۆگۆیانەی لە نێوان شیعرو پەخشان داناوە .

سۆکرات ( ٤٦٩ - ٣٩٩ پ . ز ) فەیلەسوفێکی ئاتینی ناودارە . هیچ بەرهەمی نووسراوی خۆی لە پاش بە جێ نەماوە , بەلام بیرو باوەڕەکانی لە گفتۆگۆکانی ئەفلاتوون دا ماون . دەستێکی بالای لە گفتوگۆی بە پرسیارو وەلام هەبووە . ئەرەستۆفانیش لە شانۆگەری ( هەور ) دا رەخنە لە سوکرات و قوتابخانەکەی دەگرێ . سوکرات بەسێ تومەت تاوانبار کرا:

+ نکولی لە خواناسراوەکانی یونان دەکا

+ داوای خوای تر دەکا

. مێشکی گەنجان تێك دەدا

لە ئەنجامدا , حوکمی مردنیان بە سەردا سەپاند و بە نۆشینی ژەهر لە ناوچوو .

١١-ئەیامبی : شیعری ئەیامبی ئەو شیعرەیە کە پێی بنچینەی لە دوو برگە پێك دێت . برگەیەکی کورت (ب ) و برگەیەکی درێژ ( - ). ئەرەستۆ

باس دەکا کە (مارگیت ) ی هۆمیرۆس یەکەم هۆنراوەیە بەم کێشە نووسراوە .

١٢-لاواندنەوە ( ئێلیجی ) جۆرە شیعرێك بوو دێرەکانی، بە نۆرە یەکی شەش پێ‌یو یەکی پێنج پێی بوو . لە بەر ئەوەی لاواندنەوە بە زۆری بەم جۆرە شیعرە دەنووسرا، ئێستا ئەم ناوە بە زۆری بۆ لاواندنەوە بەکاردێ . لەوانەیە وشەی ئێلیجی پەیوەندی بەوشەیەکی بیانییەوە هەبێ کەمانای( نای ) دەدا . واتە ئێلیجی گۆرانی ( نای )یە .

١٣-هۆمیروس : گەورەترین شاعیری کۆنی یۆنانی و خاوەنی ( ئیلیادە ) و ( ئۆدیسە)یە . یۆنانەکان بڕوای تەواویان بەوە هەبووە کە ئەم دوو داستانە بەرهەمی ( هۆمیروسن، بەلاّم لە بارەی ژیان هۆمیروسەوە جیاوازییان هەبووە . لە بارەی سەردەمی ژیانی هۆمیروس بۆچوونی جیاجیا هەیە: (چەچەسی ) بێزەنتینی دەڵێ هۆمیروس هاوچەرخی شەڕی تەروادە بووە . بلوتارك دەڵێ یەکسەر دوای شەری تەروادە ژیاوە . فیلۆستراتوسی ئەسکەندەری دەڵێ لە سەر دەمی کۆچەرایەتی ئەیۆنییەکان ژیاوە . هێرۆدۆتس دەڵێ لە ناوەراستی سەدەی ( ١٩ ) ی پ . ز . دا ژیاوە . تێوپۆمپوس دەڵێ ( ٥٠٠ ) ساڵ دوای شەڕی تەروادە ژیاوە .

لە بارەی نیشتمانی هۆمیروسیش ڕای جیاجیا هەیە . سیمۆنیدس دەڵێ خەڵکی دوورگەی کیوس بووە , پندارى شاعیر دەڵێ خەڵکی ئەزمیر بووە. هۆمیروس بەرهەمەکانی بەزاری ئەیۆنی نووسیوەو ئەگەر ئەم بەڵگە زمانەوانییە وەربگرین دەبێ خەڵکی ئەیۆنیا بێ . ئەیۆنیا ئەو بەشەی ولاّتی یۆنانە کە دوورگەکانی دەریای ئیجەو کەناری رۆژوای ئەنادۆڵ دەگرێتەوە , هەندێ دەڵێن هۆمیروس کابرایەکی کوێربووە . بەولاّتی

یونانندا سووڕاوەتەوە و بە دەم مۆسیقاوە داستانەکانی بە شیعرو ئاواز بۆ خەڵك گێڕاوەتەوە . هۆمیرۆس چ کەسێکی خەیاڵی بووبێ ( وەکوو هەندێ بۆی دەچن ) و چ شاعیرێکی بلیمەت بێ‌و کەرەستەی ئەدەبی پەرت و بڵاوی پێش خۆی کۆکردبێتەوە و بەم تۆکمەو پتەوییە لە دوو داستاندا دایڕشتبێ و چ خۆی داهێنەری ئەم دوو داستانە بێ . گرنگ ئەوەیە ئەم دوو داستانەی هۆمیروس تا سەدەی ( ٦ ) ی پ . ز . هەر بە سەر زاری خەڵکەوە بوون و یەکەم جار لە سەردەمی ( پیریستراتوس )ی فەرمانڕەوای ئاتین ( ٥٦٠ – ٥٢٧ پ . ز ) تۆمار کراون.

١٤- ئەمپیدۆکلیس ( ٤٩٢ –٤٣٣ ) فەیلەسوف و زاناو شاعیرو گوتاربێژ و پیاوی دین و دەوڵەت و پزیشك بووە .. دوو هۆنراوەی بە کێشی شەش پێی هەیەو باسێکیشی لە بارەی ( سروشت ) و ( پاکبوونەوە ) نووسیوە . لایەنگرێکی سەرسەختی دیموکراسی بووە . هەندێ ڕای سۆفیگەری تایبەتی هەبووە . ( بۆ نمونە وەکوو ئەوەی کەوای بۆ دەچوو خۆی خوایەو پێشتر منداڵ و دەوەن و باڵندەو ماسی دەریا بووە ). ئەم بیروڕایە سۆفیگەرییەی وای کرد بوو زۆر چیرۆکی لەبارەی ژیان و بە سەرهاتەوە بکەوێتە ناوەوە . لە کتێبی ( سروشدا ) دەڵێ: بوون لە چوار ڕەگەز پێك هاتووە : ئاو , هەوا , ئاگر . خۆڵ کە ڕەگەزی ئەبەدین و پێیان دەڵێن (ڕەگ ) . بە لای ئەوەوە یەکگرتن و لێك پچڕانی نێوان ڕەگەکان بۆ دوو هێزی گەورە دەگەڕێتەوە کە خۆشەویستی‌و ڕقە. لە کتێبی ( پاکبوونەوە )دا . خولی کەسێتی وا پێشان دەدا کە بەم جۆرە قۆناغەکانی بەدوای یەکدا دێن:

بێتاوانی، پیسی، کەوتن، پاکبوونەوە، بەخوابوون.

١٥-ئەرەستۆ لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ دەرووژێنێ: ئایا چ جۆرە بەرهەمێك بەشیعر دادەنرێ؟ هەر قسەیەکی کێش و سەروای هەبێ؟ یان شیعر خەسیەتی تری جگە لە کێشی هەیە دەیکا بە شیعر؟ ئەرەستۆ پێی وایە دەشێ مرۆڤ تەنیا پەخشان بنوسێ و بە شاعیریش دابنرێ، یان تەنیا هۆنراوەی هەبێ و بە پەخشاننوس دابنرێ، وەکو ئەمپیدۆکلیس، ئەو لەبەرئەوە شاعیر نییە کە هۆنراوەی داناوە، یان بابەتی (سورشت)ی بەکێش دارشتووە، بەڵکو لەبەر ئەوە شاعیرە چونکە پەیرەوی شێوازی بنچینەیی شیعری کردووە کە لاسایی کردنەوەیە واتە لای ئەرەستۆ شاعیر بەلاسایی کردنەوە شاعیرە، نەك بە پەیرەوکردنی کێش.

١٦-کیریمۆن: شاعیرێکە لەنیوەی دووەمی سەدەی (٤)ی پ.ز ژیاوە.چەند تراجیدییەکی نووسیوە. خاوەنی هۆنراوەی (کەنتۆریس)ە.شانۆگەرییەکانی زیاتر بۆ خوێندنەوەبوون تا نواندنی سەرشانۆ. بەرهەمەکانی پڕن لە خوازەو ڕازاندنەوەو جوانکاری.

١٧-کەنتۆریس: کۆمەڵە کێوییەك بوون، گوایا سەریان مرۆڤو لەشیان ئەسپ بووە، لەدارستان و لێرەوارەکانی هەرێمی ئێلیس و ئەرکادیا و تسالیا ژیاون و، هۆمیروس لە ئیلیادەدا بە ئاژەڵ ناویان دەبا، بە ئالۆشی زایەندو زێدەڕەوی لە نۆشینی شەراب ناسرابوون، هەندێ لایان وایە کەنتۆریسەکان نەوەی (ئیکسیۆن)ن، بەڵام لای پندارو هی تر نەوەی کەنتۆریسی کوڕی (ئیکسیۆن) و (نیفیلا)ن.

باوترین ئەفسانە لەبارەی کەنتۆریسەکان ئەوەیە کە لەگەڵ (لابیت)ەکان کەوتنە دووبەرەکی، ئەوەبوو (بیریتۆس)ی پاشای (لابیت)بانگی کردن بۆ سەر زەماوەندی خۆی، کەنتۆریس (یوریتیون) و هەندێکی تر ویستیان دەستدرێژی بکەنە سەر ژنانی (لابیت) و بوو بە شەڕو لەو شەڕەدا

کەنتۆریسەکان تەفروتوونا کران، بەڵام دوای ئەوەی (کینوس)یان کوشت کە دەیانگوت بەکەس ناکوژرێ. کاتێ هەرقەل چووە سەردانی کەنتۆریس (فۆلوس)، لەگەڵ هۆزی کەنتۆریسەکان کەوتە جەنگ، ئەوان کە بۆنی شەرابیان کرد بە بەردو کەور پەلاماری هەر قەلیان داو هەر قەل بەرمو داری گڕدار بەرپەرچی دانەوە، کەنتۆریسەکان بەزین و ڕایان کرد بۆ سەر ترۆپکی چیای (مالیا).

هەندێ کەنتۆریس ئەفسانەی تایبەتییان لەسەر هەیە. بۆ نموونە، کەنتۆریس (نیسوس) ئامادەیی نیشان دا (دیانیرا) لەڕووباری (ئۆینوس) بپەڕێنێتەوەو ویستی دەست درێژی بکاتە سەر، بەڵام هەرقەل کوشتی، ئەویش بەر لە مردنی کراسێکی دایە (دیانیرا) کە پاشان بوو بە هۆی لەناوبردنی هەرقەل.

لەناو هەموو کەنتۆریسەکان، (کیرون) بەژیری و زانستی پزیشك بەناوبانگ بوو. باوکی ناوی (کرۆنۆس)و دایکی ناوی (فیلیرا)بوو. دەستێکی باڵای لە پزیشکی و هونەرەکانی تردا هەبوو.

١٨-ڕاپسۆدی-Rhapsodia: جۆرە شیعرێك بوو بەکێشی جۆراوجۆر دەنوسرا. شاعیرە گەڕیدەکان گوند بە گوند دەگەڕان و بەدەم چەنگ لێدانەوە ئەم شیعرانەیان بە ئاوازو گۆرانی بۆ خەڵك دەخوێندەوە. شیعرەکان، یان هی شاعیرانی پێش خۆیان بوون، یان خۆیان دایاندەنا. وەکو (کلیمنت)ی خەڵکی ئەسکەندەریە باسی کردووە شاعیرەکان دەستکاری شیعری شاعیرانی پێش خۆیان دەکردو دووبارە دەیاندەڕشتەوە، پندار دەڵێ ڕاپسۆدییەکان زۆر شیعری خۆیان لەگەڵ شیعری هۆمیروس تێهەڵکێش دەکرد، هێرودۆتوس باس دەکا کە ئەمانە وردە وردە بوون بە توێژێکی تایبەتی ئیشیان گێرانەوەو خوێندنەوەی

شیعر بووو بەوە بڕێوی خۆیان پەیدا دەکرد، بەڵام وەکو ئەفلاتوون لە (ئەیۆن)دا باس دەکا خەڵك داوای لێ دەکردن شیعرەکان لێك بدەنەوەو قسەیان لەسەر بکەن.

١٩-هێنانەوەی کیریمۆن بە نموونە کە لە (کەنتۆریس)ەکەیدا کێشی کۆن و نوێی تێکەڵ کردووە، بۆ ئەوەیە ڕوون بێتەوە کە هەر تەنیا کێش بەس نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێ بە شاعیر، واتە لای ئەرەستۆ شیعرییەت و شاعیرییەت بەکێش نەبەسراوەتەوە، بەڵکو بەلاساکردنەوە بەسراوەتەوە، شیعر لای ئەرەستۆ ئەوەیە لاسای کردەوەیەك بکاتەوە، ئەوەی بابەتێکی زانستی بەکێش بهۆنێتەوە، نابێ پێی بگوترێت شاعیر، چونکە کارەکەی لاساکردنەوەی تێدانییە، بەڵکو تەنیا شتی ڕاستەقینەی تێدایە.

٢٠-نۆمۆس-Nomos:جۆرە ئاوازو گۆرانییەکی تایبەتی بوو کێشی جۆراوجۆری تێدا بەکاردەهات و پەیوەندی بە دیترامبەوە هەبوو. یەك کەس بەتەنیا بەدەم چەنگ و نایەوە بۆستایشی هەندێ خواو بەتایبەتی ئەپۆلۆ پێشکەشی دەکرد، (تێرپاندەر) ئەم ئاوازو گۆرانییەی بۆ چڕینی هەندێ پارچەی داستانەکانی ئەو ڕۆژگارە داهێناوە،ئەم هونەرە لەناو گەل و نەتەوەی جیاجیای وەکوو دۆرییەکان و ئایۆلییەکان و فریکییەکان و لیدییەکان و ئەیۆنییەکان کێش و ئاوازی جیاجیای هەبوو.

٢١-شانۆگەریش وەکو هونەرەکانی تر شتێکی دروستکراوە، بەو مانایەی کە خۆی لە سروشتدا نەبووە وەکو داروبەردو ڕووبارو چیا...بەڵکو لە داهێنان و دروستکردنی مرۆڤ خۆیەتی.

# پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١-بابەتی دراما باسی مرۆڤ دەکا لەکاتی ئەنجامدانی کردەوەیەکا، جا چۆن هەر کردەوەیەك سروشتو خەسیەتی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوەی کردەوەکەش ئەنجام دەدا، کە مرۆڤە، بەهەمان شێوە سروشتو خەسیەتی تایبەتی خۆی هەیە، چ خەسیەتی ناوەوە بێ‌و چ خەسیەتی دەرەوە.

٢-واتە جیاوازییەکە لە بنەڕەتدا جیاوازییەکی ڕەوشتپەروەرییە لەنێوان مرۆڤی باش‌و مرۆڤی خراپ دا، لێرەدا مەبەست لە ڕەوشتپەروەری کردەوەی گەورەیە کەدوور نییە لای هەندێ کەس بەخراپە لێك بدرێتەوە وەکو کردەوەی جەنگاوەران‌و شتیوا، ئەرەستۆ وشەی (Spoudaioi)و وشەی (Phauloi) بۆ ئەم دوو جەمسەرە بەرامبەرە بەکارهێناوە.

٣-پۆلیگنۆتس: نیگارکێشێکی ناوداری یۆنانی بوو، لەسەدەی (٥)ی پ.ز ژیاوە. کوڕی (ئەگلاوفۆن)ی خەڵکی (تاسۆس)بوو. پاشان بوو بە هاونیشتمانێکی ئاتینی، بەرهەمە هەرە گرنگەکانی خۆی لەنێوان (٤٧٥-٤٤٧)پ.زئەنجام دراوە. .زیاتر نیگاری پیاوە گەورەکانی دەکێشا، وای دەکێشان یان خەریکی کارێکی گەورەن، یان لەژێر کاریگەری ڕووداوێکی گەورەدان. پۆلیگنۆتس دۆستی (کیمۆن)و (سۆفۆکلیس)بوو، دوای سالی (٤٦٠)پ.ز نیگاری (ئیلیۆپێرسیس)و (نیکیا)و هەندێ نیگاری لە پەرستگای (دەلف)و (دیسوس) کێشا.

٤-پۆسۆن: نیگارکێشێکی ناوداری سەدەی (٤)ی پ ز بوو. کوڕی (بروس)و شاگردی (پامفیلوس) بوو. (بلینی) باس دەکا کە پۆسۆن یەکەم کەس بووە نیگاری لەسەر بنمیچ کێشاوە. زیاتر نیگاری بچوك و بەتایبەتی نیگاری گوڵ و منداڵی دەکێشا. لە بەکارهێنانی ڕەنگی مۆمی. دەستێکی باڵای هەبوو. (ئەرەستۆفانیس) لە کۆمیدی ئەرکانییەکان دا. تانەو تەشەری لێداوەو ئەرەستۆ لە گوتاری (سیایەت)دا ناوی دەباو دەڵێ نابێ بەرهەمەکانی پێشانی گەنجان بدرێن.

٥-دیونیسیوس: نیگارکێشێکی ناوداری یۆنانی بوو، هاوچەرخی پۆلیگنۆتس بوو.

٦-کلیۆفۆن: شاعیرو سیاسەتمەدارێکی ئاتینی بوو. ئەرەستۆ لە (هونەری شیعر)دا دووجارو لە (گوتار)دا یەك جار ناوی بردووە. کلیۆفۆن چەند تراجیدییەکی نووسیوە تەنیا ناویان ماوەو لەبارەی کاروبارو بەسەرهاتەکانی ژیانی ڕۆژانە شیعری داشۆرینی بەکێشی پاڵەوانیتی نووسیوە. سەرۆکی پارتی دیموکراتی بوو. دوای گەڕانەوەی دیموکراسیەت بۆ ئاتین لەساڵی ٤١ پ.ز سیستەمی کۆکردنەوەی باروبووی دانا کە پێی دەگوترا (دیوبیلیا)و ڕۆژێ دوو ئۆپول بوو. بەڵام دیار نییە ئەم باروبووە بۆ کێ کراوە. لەنێوان ساڵانی (٤١٠-٤٠٦) پ ز لێپرسراوی دارایی ئاتین بوو، بەڵام لەبەر دەستپاکی خۆی بە هەژاری و نەداری سەری نایەوە. زۆر لای دەکرد بەلای توندوتیژیدا. دوای جەنگی سیزیکوس لە ٤١٠ پ.ز بەیەك کات بەلاماری (کریتیاس)و (ئەلسبیادیس)ی دا، مەرجەکانی ئاشتی ئەسپرتەی ڕەت کردەوەو دوای جەنگی نیگۆسپۆتامیش ئەم هەڵوێستەی دووپات کردەوە. گیراو ساڵی ٤٠٤ پ.ز لەسەریان دا.

٧-هیگیمۆن: لەسەدەی پێنجەمی پێش زاین ژیاوە. خەڵکی (تاسۆس) بووە، یەکێ بووە لە شاعیرانی کۆمیدی کۆن. ئەو بوو گەشەی بە (پارۆدی)دا، تا وای لێهات بوو بە هونەرێکی سەربەخۆ، یەکێ لەبەرهەمە ناودارەکانی بەناوی (زۆرانبازی بۆق و مشك) بوو.

٨-پارۆدی: بە یۆنانی مانای (دژە سروود) دێ. بەرهەمێکی ئەدەبییە نووسەرەکەی لاسای بەرهەمێکی ئەدەبی تر دەکاتەوە بەڵام بەشێوەی دژو پێچەوانە بۆ گاڵتەو پێکەنین، ئەمەش بەهۆی بەکارهێنانی هۆکاری جیاجیا دێتەدی، وەکوو زێدەڕەوی لە نیگارکێشاندا تا دەگاتە پلەی گاڵتەجاری(ئەرەستۆفاتیس) لەم بوارەدا لە هەموو ئەوانی دی بەتواناتر بوو، بەتایبەتی وەك لە سروودی (کلیکە) لە شانۆگەری (بۆق)دا هاتووە. ئەفلاتوون هەندێ پارۆدی لەناو گفتوگۆکانیدا هەیە.

٩-نیکۆکاریس: شاعیرێکی کۆمیدی سەدەی (٤)ی پ.ز ی یۆنانی بوو، باوکیشی کۆمیدینووس بوو.

١٠-دێیلاد: وشەی (دێیلاد) بەمانای (داستانی ترسنۆکان) دێ.وشەی (دێیلۆی) بەیۆنانی یانی ترسنۆك و قەڵەزراو، دیارە ئەم بەرهەمە بەربەرچدانەوەی گاڵتەجاریی (ئیلیادە)ی هۆمیروسە کە داستانی پاڵەوانانەیە.

١١-تیموتیوس: (٥٤٠-٦٣٠پ.ز) شاعیرێکی دیترامبی خەڵکی (میلیتوس) بوو. (تیموتیوس)و (فیلۆکسینوس) هەردووکیان (کیکیوپس)یان کردۆتە بابەتی نوسین، یەکەم بەشێوەی نۆمۆس نووسیویەتی بۆیە کەسەکان لەژیانی واقیعی باشتر کێشراون، کەچی دووەم بەشێوەی دیترامب نوسیویەتی بۆیە کەسەکانی لە واقیع نزمترن.

١٢- فیلۆکسینوس: شاعیرکێی دیترامبی سەدەی چوارەمو پێنجەمی پ.ز بوو. لەبارەگای (دیۆنیسیوس) ژیاوە. بەناوبانگترین شانۆگەرییەکانی (کیکیوپس)بوو. (ئەرەستۆفانیس)، لە (پلوتوس)دا، بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕی لاسای ئەم شانۆگەرییە دەکاتەوە. فیلۆکسینوسێکی تریش هەبووە، کوڕی (ئیریکسیس) بووە. ناوی لە شانۆگەری (بۆق)ی ئەرەستۆفانیس دا هاتووە. بەرهەمێکی شیعری هەیە بەناوی (میوانداری).

١٣-کیکلۆپوس: وشەکە بەمانای (خاوەن یەك چاوی خڕ)دێ. گوایە دێوی ئەفسانەیی بوونەو لە شوێنێ ژیاون (سەقلیە)ی ئێستا دەگرێتەوە. (هزیود) ئەم (کیکلۆپ)انە بەنەوەی (ئۆرانوس-ئاسمان)و (گی-زەمین) دەزانێ، ئەمانە سێ دێو بوونە: (برۆنتێس)و (ستیرۆپێس)و (ئارگێس). یۆریپیدیس شانۆگەرییەکی ساتیری بەم ناوە هەیە. تاکە نموونەیەکی ئەم جۆرە ساتیرەیەکە تا ئێستا مابێتەوە.

١٤-لەڕاستیدا، بابەتی لاسای کردنەوەی درامی، خەڵکی وان، یان لەئاستی گشتی بەرزترن، یان لەئاستی گشتیدانو یان لەئاستی گشتی نزمترن...مانای ئەوەیە یان لاسایی شتی باشترو بەرزتر دەکاتەوە، یان لاسای شتی پەستو نزمتر دەکاتەوە، یان لاسای شتی ئاسایی دەکاتەوە کەلەنێوان بەرزیو نزمیدایە. تراجیدی لاسای شتی باشترو بەرزتر دەکاتەوە، کەچی کۆمیدی لاسای شتی پەستو نزمتر دەکاتەوە.

# پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

١-لە (ئیلیادە)و (ئۆدیسە)ی هۆمیروسدا، ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ هەن، لە سرودی (٩-١٢)ی ئۆدیسەدا، ئۆدیسوس بەبەرقسەدا دەچێ هەروەك ئەوەی کەسێتیەکی درامی بێ‌و قسەبکا. دەوری سێ لەسەر پێنجی شیعری ئیلیادە قسەی ڕاستەوخۆیەو لەسەر زمانی کەسەکانەوە گوتراوە. ئەرەستۆ بەگشتی ئاماژە بە (قسە ڕاستەوخۆ)کان دەدا کە سیمایەکی درامی بەبەرهەمەکانی هۆمیروس داوە.

٢-ئەرەستۆ دەڵێ شێواز جۆرەکانی شیعر لەیەك جیا دەکاتەوە، وەکوو شیعری داستانی‌و گۆرانی‌و درامی، ئەم شێوازانە بە زۆر جۆر هاتوون:

-لاسا کردنەوەی ڕاستەوخۆ، وەکو گێڕانەوەی ساف

-لاسای کردنەوەیەك کە هەندێکی ڕاستەوخۆبێ‌و هەندێکی ناراستەوخۆ، وەکوو ئەو داستانانەی هەندێ پارچە گێڕانەوەیان تێدایەو لە هەندێکی تردا کەسەکان خۆیان قسە دەکەن.

-لاسا کردنەوەی تەواو، کە هەموو بەرهەمەکە لەشێوەی لاسا کردنەوەدا بێ وەکوو دراما، کە کەسەکان ڕاستەوخۆ لاسای کردەوە دەکەنەوە.

٣-سۆفۆکلیس کوڕی سۆفیلوس بوو. یەکێ بوو لە شاعیرە تراجیدییە هەرە ناودارەکانی سەدەی پێنجەمی پ.ز. ڕاستە تراجیدی لە داهێنانی بەهرەی ئەسخیلوسە، بەڵام بەشارەزایی‌و لێهاتوویی سۆفۆکلیس بوو

گەیشتە پۆپە، سۆفۆکلیس دەوری ٤٩٤ پ.ز لە گوندی کۆلۆنوس هیپوسی نزیک ئاتین لە دایک بووە. باوکی کارخانەی چەکسازی و ئاسنجاوی هەبوو، واتە یەکێ بووە لە دەوڵەمەندەکانی سەردەمی خۆی.

سۆفۆکلیس پیاوێکی کۆک و ڕەوشت بەرزو سپ و ساخ بوو. لە منداڵیەوە بەنازو نیعمەتی منداڵە دەوڵەمەندان گەورە ببوو. مۆسیقای لای لامبروس خوێند کە مامۆستایەکی بەناوبانگی هاوچەرخی خۆی بوو، لەسەماو یاری و بیرکاری و شیعردا دەستێکی باڵای هەبوو، لەسەردەمی گەنجێتیدا، خەریکی کاروباری سیاسی و سەربازی و ئاینی بوو لە ئاتین. ساڵی ٤٤٠ دووجار کرا بە سوپا سالارو ساڵی ٤١٢، دوای شکانی هێرشەکەی کردیانە سەر سەقیلە، کرا بە ئەندامی لیژنەی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت.

سۆفۆکلیس جگە لەمانە، هەڵکەوتوویەکی بواری دراما بوو. بۆ ماوەی (٦٠) ساڵ بەشداری زۆر پێشبڕکێی شانۆگەری کرد. دەڵێن ١٢٠-١٣٠ شانۆگەری نوسیووە، بیست جار لە پێشبڕکێکانا بەیەکەم دەرچووە، لە سەرچاوەکانا هاتووە کە یەکەم جار لە پێشبڕکێی ساڵی ٤٦٨ پ.ز یەکەمی هێناوە، سۆفۆکلیس ساڵی ٤٠٦ پ.ز کۆچی دوایی کرد، وەکوو پاڵەوانێکی گەورە ئاهەنگی ساڵانەیان بۆ گێڕا.

ئەمانە هەندێکن لەو شانۆگەرییانەی کە ماون:

*ئەجاکس

*ئەنتیگۆنە

*ئۆدیپ پاشا

*ئەلیکترا

*ژنانی تراخیس

*فیلوکتیتس

*ئۆدیپ لە کولونوس

٤-ئەرەستۆفانیس گەورەترین کۆمیدینووسی یۆنانی بوو، دەوری سالی ٤٤٥ پ.ز لە گەڕەکێکی شاری ئاتین هاتۆتە دنیاوە، هەندێکی تریش دەڵێن لە میسرو لە شارێکی باکووری دەلتا هاتۆتە دنیاوەو لەوێوە چۆتە یۆنان. دەوری چل شانۆگەری کۆمیدی نووسیوە، بەلام تەنیا (١١)یان ماون، چوار خەلاتی یەکەمو دوو خەلاتی دووەمو یەك خەلاتی سێیەمی بە شانۆگەرییەکانی وەرگرتووە.

ئەرەستۆفانیس لە رەخنەو داشۆرینەکانی میانڕەو بوو، تەنیا لە داشۆرینی (کلیۆن)ی سیاسیو (یۆرپیدیس)ی شاعیر نەبێ. لە سیاسەتدا لایەنگری ئورستوکراتیەت بوو، زۆر بەرگری لە ئاشتی دەکرد. هەمیشە داوای ئاشت بوونەوەی ئاتینو ئەسپرتەی دەکرد، لە سیاسەتو ئەدەبو ئاینو مۆسیقادا پارێزگار بوو، دژی نوێخوازەکان بوو.

ئەمەش ناوی هەندێ لە کۆمیدییەکانی:

* خەڵکی ئەفارینا

* فارسەکان

*هەور

*زەردەواڵە

*جەژنی تسموفۆریا

*بۆق

*پەرلەمانی ستات

*پلۆتس.

٥- لە دەقەکەدا، وەرگێرانەکەی بە (کارا-بکەر)ەکان دێ. لە دراما دا بەمانای (کردن) هاتووە.

٦-دۆری: دانەپاڵە بۆ (دۆریس) ئەمانە یەکێ بوون لە چوار نەتەوە سەرەکییەکەی گەلی یۆنان، خەڵکی (میگارا)و زۆربەی خەڵکی (پێلپۆنیس)و (سەقلە) دۆری بوون.

هەرچەندە یۆنانەکان خۆیان برِوایان وایە کە بەرِەسەن خەڵکی ئەو دوورگەیەن، بەلاّم لەرِاستیدا ئەمانە لەئاسیاوە هاتوون، واتە هیندو ئەوروپین، ئەمانە لە بنچینەدا چوار خێڵی جیاواز بوون لە بنەچەکە وزاری ئاخاوتنەوە، (ئەیۆلی)و (دۆری) لە باکوورو (ئاخی)و (ئەیۆلی) لەباشور بوون، بەلاّم پاشان خەڵکی (تسالیا) پەلاماری باکووریان دا ئیدی (ئەیۆلی)یەکان بەرەو ئاسیا کۆچیان کردو دورگەی (لسبوس)و کەناری (دەردەنیل) یان تا کەنداوی (ئەزمیر) داگیر کردو ئەو ناوچەیان ناونا (ئەیۆلیا) کەچی (دۆری)یەکان شۆربوونەوە بۆ (ئاتیک)ی باکور (موریَ)و تاقمێکیان بە دەریادا چوونە ئاسیاو دوورگەی (خیوس)و (ساموس)و کەناری دەریایان لە ئەزمیرەوە تا رِوباری (میاندەر) داگیر کردو ناوچەکەیان ناونا( ئەیۆنیا).

٧-میگاری: دانە پاڵە بۆ (میگار) کە پایتەختی هەرێمێکی یۆنانی بوو دەکەوێتە سەر بەرزایی (کۆرنیت). خەڵکەکەی لە نێوان سالاّنی ٧٢٠-٥٥٠ پ.ز رەوە رەوە کۆچیان دەکرد بۆ وولاّتی ترو کۆلۆنیالیان دروست کرد . ( میگارای هیلایا ) یان لە سەقلیە و ( کالیدۆن ) و بێزەنت یان لە بسفۆر و (هێرقلیای پۆنتیکا ) یان لە ( بتینیا ) دروست کرد . سالّی ٦٠٠ پ. ز ( تیاگنیپس ) ی زۆردار فەرمانرِوایی دەکرد . , دوای ئەوە، میگارا تووشی هەڵوەشانەوەو دابەشبوون هات .. لە سەدەی ( ٤ ) ی پ . ز دا، میگارا دەوری بێلایەنی هەبوو لە شەرِی نێوان شارەکانی یۆنان و لەبووژانەوەدا بوو . بەلاّم لە شەرِی دژی ( فلیپ ) ی مەکدۆنی چووە پالّ

ئـاتین و دووبـاره لـه سـەردەمی هیلینـستی، واتـه دوای دەرکـەوتنی ئەسـکەندەری گـەوره ئەسـتێرەی ئـاوا بـوو . میگـارا بنکەیـەکی کـاتی فالسەفەی سوکرات بوو.

٨. واته دەورو بەری سالّی ٦٠٠ پ . ز , دوای نەمانی فەرمانڕەوایی (تیـاگینیس) ی زۆردار، میگـارا کـه دەوڵەمەنـدەکانی بـەرەوە سـەربڕی و زێوانی بۆ خۆی دانا، کچەکەی خۆی دایە( کۆڵۆن ) ی ئاتین و یارمەتی دا بۆ ئەوەی ببیّ به زۆردار .

٩ . ئیپیکـارموس : شـاعیرێکی کۆمیـدی خـەڵکی سـەقەلیه بـووه . له سـەدەی ( ٥ ) پ . ز ژیـاوه . دەوری ( ٣٥ – ٥٢ ) شـانۆگەری کۆمیـدی نووسـیوه . بـەلای ئەرەسـتۆ ئەوەیـه کـه ئیپیکـارموس هاوچـەرخی (کیونیدس ) و ( ماگنیس ) بووه . بەلاّم به تەمەن لەوان گەورەتر بووه و له نووسینی کۆمیدی دا لەوان کۆنتره .

١٠ . کیونیدس : له چواریەکی کۆتایی سەدەی ( ٥ ) پ . ز ژیاوه . به پێشەوای کۆمیـدی کـۆنی دادەنـێن , سـالّی ٤٨٦ پ . ز، یەکـەم پاداشتی وەرگرتووه .

١١ – مـاگینس : یەکێکـه لـه کۆمیـدی نووسـه هـەره کۆنـەکان . دەوری سالّی ( ٥٠٠ ) له ئاتین له دایك بووه و له سالّی ٤٧٢ خەلاّت کراوه . ( ١١) جار سەرکەوتنی به دەست هێناوه ..

١٢ . پیلۆپـۆنیس : مەبەسـتی خـەڵکی ( سـیکۆت)ە کـه بریتیـه لـه ناوچەی رۆژئاوای کۆرنتـۆس .. دوو میل لـه کەنارەوە دووره. ئەمڕۆ پێی دەکوترێ نیو دوورگەی مۆریّ ..

١٢- كۆمارزێن : واته ڕۆیشتن به کوچه‌و و به ناوشاردا , به ده‌م سروود و گۆرانی مۆسیقاوه . به تایبه‌تی له ئاهه‌نگی جه‌ژنی ( باخوس )دا. ئه‌ره‌ستۆ لێره‌دا باسی لێکدانه‌وه‌ی جیاجیای وشه‌ی ( کۆمیدی ) ده‌کا ..

١٤- دران : ئه‌مه سه‌رچاوه‌ی وشه‌ی ( دراما ) یه که به مانای (کارده‌کات) دێ ..

١٥ . دیاره ته‌جره‌به‌ی ئه‌ره‌ستۆ بۆ تراژیدی به دوو قۆناغ هاتووه

+ دیاری کردنی هۆیه‌کانی بیرکردنه‌وه له کاری هونه‌ری که پێش هاتنه کایه‌ی کاره هونه‌رییه‌که ده‌که‌وێ .

+ مێژوو و لق و جۆره‌کانی تراجیدی ..

# پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

١-باسکردنی پەیدابوونی شیعر سەر دەکێشێ بۆ باسکردنی سروشتی مرۆڤ . ئەو رایانەی ئەرەستۆ لێرە پێشکەشیان دەکا بەشێکن لە گفتۆگۆی ئەرەستۆ لە بارەی شاعیر خۆیەوە . شیعر شتێکی سروشتییە لای مرۆڤ چونکە شیعر دوو هۆی هەیە و هەردووکیان سروشتین .

ا- ئارەزووی لاسا کردنەوە کە مرۆڤ لە گیاندارەکانی دی جیادەکاتەوە و هەر لەم رێگایەشەوە زانیاری سەرەتایی خۆی بە دەست دێنێ ..

ب - چێژ وەرگرتن لە کردەوەی لاساکردنەوە ..

٢ – هۆی یەکەم بەداهێنانی شیعری و هۆی دووەم بە چێژوەرگرتنی خەڵك لە شیعر، لێك دەداتەوە .

٣ – تا ئێرە هۆی یەکەم بوو .. لێرەوە هۆی دووەم دەست پێدەکات ..

٤- لێرەدا ئەرەستۆ وای بۆ دەچێت کە چێژی لاساکردنەوە جۆرێکە لە چێژی شت فێربوون . ئەرەستۆ لە ( میتافیزیك)دا دەڵێ ئارەزووی فێربوون‌و زانینی شت وەکوو غیرە وایە، لای هەموو کەس هەیە، ئەگەر چی بە تایبەتی لای فیلەسووفەکان دەردەکەوێ ..

٥- ئەرەستۆ لە ( هونەری گوتار ) دا باس دەکا کە چێژی بینینی وێنەو نیگار بەشێکە لە چێژی بینینی وێنە کێشراوەکە .

٦ – چێژ وەرگرتن، کە ئەرك و ئامانجی هەموو لاساکردنەوەیەکە، هەر تەنیا لە وێنەکەدا نییە بەو شێوەیەی شتە وێنەکێشراوەکە دەیسەپێنێ ..

بەڵكو لە شێوازی لاسا كردنەوەكەشدایە كە هۆیەكی سەرەكی ئەنجامدانی كارەكەیە .

٧ - ئەفلاتوون لە كتێبی ( یاساكان ) دا باس دەكا كە ئارەزووی سروشتی بۆ ئیقاع و گونجان توخمێكی بنچینەیی كاری هونەرییە . ئەمە بەڵگەیە بۆ پەیوەندی نێوان شیعرو مۆسیقا ..

٨ - ئەرەستۆ لە سەرەتای ئەم بەشەدا دەڵێ سەرهەڵدانی شیعر بۆ دوو هۆی سروشتی دەگەڕێتەوە لە مرۆڤدا .. بەڵام ئەگەر لەو دوو هۆیە وردببینەوە كە دەیانهێنێ دەتوانین بە چوار شت لێكیان بدەینەوە ..

ا ـ مرۆڤ بوونەوەرێكی لاساكەرەوەیە .

ب ـ چێژ لە بینینی لاساكردنەوە وەردەگرێ .

ج ـ حەزی لە فێربوونە .

د ـ بە سروشت حەز لە ئیقاع و كێش دەكا ..

٩–ویردوسروود بۆ سوپاسی خواو پیاهەڵدان بۆ ڕێزلێنانی شاعیر بوو.

١٠–مارگیتس: داستانێكی كۆمیدی كۆنە، تەنیا چەند وشەیەكی ماوە. لە وشەی (مارگۆس–كەودەن) داتاشراوە. بابەتەكەی ئەوەیە گوایە مارگیتس كەودەن بووە، بەڵام زۆر شتی زانیوە، زۆر بەدبەختیش بووە. كەسێتیەكی لیبۆك و گاڵتەجارە، بەرامبەر بەكەسێتی گەورەو سەنگینی (ئۆدسیوس).

١١–هۆنراوەی (مارگیتس) بەكێشی ئەیامبی شەش پێیی و سێ پێیی بووە. وشەی ئەیامبۆ مانای شەڕە جوێن دێ، ئەرەستۆ لای وایە وشەی ئەیامبیۆن لە (ئەیامبیزۆ–جوێن دەدا) هاتووە.

کێشی ئەیامبی لە دوو بڕگە پێك دێ (کورت+درێژ ب−).وشەکە یەکەم جار لای (ئەرخیلوکس) هاتووە کە باسی شیعری داشۆرینی خۆی دەکات و بەکێشی ئەیامبی نوسراوە، بەڵام ئەرخیلوکس یەکەم کەس نەبووە کێشەکەی بەکارهێنابێ، ئەرەستۆ دەڵێ (مارگیت)ی هۆمیروس یەکەم هۆنراوە بووە بەم کێشە نوسراوە.

١٢-لێرە مەبەست لە سیمای درامی چنینی ڕوداوەکان و بنیاتی ناسینەوەو دۆزینەوەو دیمەنی کتوپڕو...ئەو جۆرە ڕەگەزانەیە کە دەکەونە ناو دراما.

١٣-ئیلیادە: واتە چیرۆکی ئەلیۆس.ئەلیۆس، یان ئەلیۆن ناوی شاری تەروادە بووە کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای ئاسیای بچووك.

ئیلیادە داستانێکی شیعری درێژە، ٢٤ سروودو ١٥٥٣٧ دێرە، باسی شەڕو شۆڕی ٤٧ ڕۆژی ساڵی دەیەمی شەڕی نێوان یۆنانیەکان و تەرادییەکان دەکا، ئابلووقەی شاری تەروادەو شکاندنی ئابڵوقەکە بە هۆی فێڵی ئەسپی تەروادەوە ڕووداوی مێژوی ناسراون.داگیرکردنی شاری تەروادە بۆ ساڵی ١٩٨٤ی پ.ز دەبەنەوە، هەندێ لە کەسەکانی ناو ئیلیادە ڕاستەقینەن بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئیلیادە پڕیەتی لە ئەفسانەو خەرافە، کە خواکان و پاڵەوانەکان دەوری سەرەکی تێدا دەگێڕن، پوختەی داستانەکە بەم جۆرەیە:

لەکاتی ئابلۆقەی تەروادەدا، ئەگا مەمنوون سووکایەتی بە (ئەخیل)ی پاڵەوان کرد. ئەخیل زویر بووو بڕیاری دا چیتر بەشداری شەڕ نەکات، ئەمەش بوو بەهۆی شکانی لەشکری یۆنانیەکان. کە یۆنانیەکان کەوتنە مەترسی ئەخیل ڕازی بوو چەکی خۆی بدا بە(پاترۆکلوس)ی هاوڕێی، ئەویش چووە شەڕو لەشکری دوژمنی بەزاند بەڵام (هیکتۆر)ی پاڵەوانی

تەروادە لێی هاتە دەستو کوشتی. ئەخیل کەزانی (پاترۆکلوس)ی هاوڕێی کوژرا، دەریای قینی هاتە جۆشو گەڕایەوە ناو شەڕو تەرواددیەکانی بەزاندو لەتۆڵەی هاوڕێکەی (هیکتۆر)ی کوشت.

١٤-ئۆدیسە:بەناوی (ئۆدیسیوس) پاشا کراوە، داستانێکی شیعری درێژە. ئەویش ٤٠ سروودو زیاتر لە ١٢٠٠٠ دێرە. باسی ڕووداو بەسەرهاتەکانی ئۆدیسیوس پاشا دەکا کە دوای سەرکەوتنی لەشەڕی تەروادەدا، لەکاتی گەڕانەوەی بۆ (ئەتاکا)ی زێدی خۆی بەسەری هاتووە.

١٥-زۆرجار بەشاعیری تراجیدی دەگوترا (مامۆستا) چونکە لەکاتی پێشکەشکردنی شانۆگەریدا خۆی مەشقی بە ئەکتەرەکانو ئەندامیەکانی کۆرس دەکرد.

١٦-ئەرەستۆ لای وایە کۆمیدی لە شیعری ئەیامبیو، تراجیدی لە داستانەوە هاتووە. تراجیدی لە کۆمیدی مەزنتر بووە چونکە ئەیامبۆ جوێندانە کەچی داستان گێڕانەوەی کردەوەی پاڵەوانانە.

١٧-ئەرەستۆ لێرەو لە جێگای تریش داوا لە شاعیری تراجیدی دەکا کە هەموو جۆرە تراجیدییەك تێکەڵ بکەن.

١٨-فالی: سروودی داشۆرینو گاڵتەو پێکەنین بوو، لە جەژنەکانی باخۆسو لەگەڵ سەماو ئاوازو لە شەرافەتی (فالیس)ی خوای زاوزێو بەروبوومو هاوڕێو یاوەری دیونیسوس، دەگوترا. وشەی (فالی)بۆ (فالۆس) دەگەڕێتەوە کە ئەندامی نێرینەیەو پەرستنی لە یۆنانو هەندێ وڵاتی تردا باو بووەو لە جەژنو ئاهەنگەکانی (پریاپۆس)ی خوای بەرهەم هێنان، بەدابو ڕێو ڕەسمی پێکەنیناوی پێشکەش دەکرا. ئەرەستۆفانیس لە شانۆگەری (ئەخارنییەکان)دا ئاماژەی بەو ڕێو

ڕەسمەی فالی داوە، سروود بێژەکان بەئاشکرا دەیانگوت پەسەندنییە کچی عازەب گوێ بدەنە ئەم جۆرە سروودو گۆرانیانە.

١٩-ئەرەستۆ وەکوو بوونەوەرێکی زیندوو سەیری تراجیدی دەکا.

٢٠-ئەسخیلوس (٥٢٥یان ٥٢٤ پ.ز لەدایك بووە) کوڕی (یۆفۆریۆن)ی خەڵکی شارۆچکەی (ئێلیوسیس)بووە کە بە ویردودابی پڕ ئاڵۆزیو نهێنی بەناوبانگە لەبارەی پەرستنی (دیمیتر)ی خوای زەویو پیتو بەرەکەت. بەخۆیو بەبرایەوە بەشداری بەرەنگاربونەوەی فارسەکانیان کرد لە جەنگی (ماراتۆن)و براکەی لەو جەنگەدا کوژرا، لەوانەیە بەشداری جەنگی (سەلامیس)و (پلاتیا)شی کردبێ، ئەسخیلوس هەستێکی ئاینی قووڵو نیشتمانی بەرزی هەبوو، بڕوای بە دەسەڵاتی دادپەروەری یەزدانی هەبوو، ئەسخیلۆس بەباوکی تراجیدی یۆنانی دادەنرێ چونکە پێش ئەو شانۆگەری زۆر سادە بوو بەزۆری پەیوەندی بە دابی پەرستنی دیونیسوسی خوای شەرابەوە هەبوو، ئەسخیلوس بە بلیمەتی خۆی تەکانێکی بەگوڕی بەشانۆگەریداو ئەکتەرێکی تریشی بردە سەرشانۆ کە تا ئەوسا تەنیا یەك ئەکتەر باوی هەبوو، زۆر بایەخی بە شکۆمەندی دیمەنوو جلوبەرگو زمانی شانۆگەری دەدا. لەبارەی بابەتیشەوە، ئەسخیلوس نوێ کردنەوەی خۆی هەبوو، شانۆگەری لە دابی ئاینی گواستەوە بۆ دەربڕینی بابەتی فەلسەفیو مرۆڤایەتی: لەسێینەی (ئۆریست)دا مامەڵە لەگەڵ گیروگرفتی(تاوانو سزا)دەکا لەبەر ڕۆشنایی جەبرو ئیختیار، هەروەها لە سێینەی (پرۆمیتوس)دا باسی یاخی بوونی زەوی لە ئاسمانو نرخی ئەو یاخیبوونەو ئاشت بوونەوەی زەویو ئاسمان دەکات، لە شانۆگەری (ژنە پاڕاوەکان) دا، باس لە تەسەوفو خۆپارێزی ژنان دەکات.

ئەسخیلوس، ساڵی ٤٨٤ پ.ز وەکوو نووسەرێکی تراجیدی گەورە ئەستێرەی گەشاوەیە کە بە تراجیدی (ژنە پاڕاوەکان) خەڵاتی یەکەمی وەرگرت، دەوری ٧٢ شانۆگەری نوسیوە بەڵام گرنگترین شانۆگەرییەکانی کەماون ئەمانەن:

١- ژنە پاڕاوەکان

٢-فارسەکان

٣-حەوتەکەی دژی تیبە

٤-کارەساتی ئۆرێست (سێیینەیە): ا - ئەگا مەمنون. ب - . فۆفۆرۆی .
ج - یۆمێنیدیس.

٥-پرۆیتوس

٦-پرۆمیتوس (سێیینەیە): ا ـــ پرۆمیتوســـی ئـــاگر بەدەســـت
ب - پرۆمیتوسی زنجیرکراو ج - پرۆمیتوسی ئازاد.

٧-ڕۆڵەکانی ئێتنا

دەڵێن ئەسخیلوس لە ژیاندا دووجار سەردانی بارەگای (هیرۆن)ی ئۆرداری کردووە: جارێکیان دوای ئەوەی هیرۆن (ئێتنا)ی دروست کردو جارەکەی تریش دوای پێشکەشکردنی (سێینەی ئۆریست).

ئەسخیلوس ساڵی ٤٥٦ پ.ز لە (گیلا) کۆچی دوایی کرد.

٢١-یەکەم کەس کە ئەکتەرێکی بردە سەر شانۆ (تیسپیس)بوو، ئەسخیلوس کردی بە دوو ئەکتەرو سۆفۆکلیس گەیاندییە سێ ئەکتەر. ئەرەستۆ لای وایە تراجیدی شان بەشانی زیادبوونی ئەکتەر گەشەی کردووەو پێشکەوتووە، هەرچەندە زۆرکەس ئەسخیلوس بەباوکی تراجیدی یۆنانی دەزانن وەکوو لە پەراوێزی ١٩دا هاتووە، بەڵام هەندێکیتر تیسپس بەباوکی تراجیدی یۆنانی دادەنێن، چونکە یەکەم

کەس بوو جگە لە کۆرس و سەرکردەی کۆرس، ئەکتەرێکی بردە سەرشانۆ لێرەوە یەکێ پەیدابوو لەسەر شانۆ گفتوگۆ لەگەڵ کۆرس و سەرکردەی کۆرس بکا، ئیتر بەمەوە دراما سەری هەڵدا چونکە کرۆکی دراما پەیدابوونی ئەکتەرو گفتوگۆیە.

دەڵێن تیسپیس لەسەدەی ٦ی پ.ز دا ، لە (ئەکاریا) لە دایک بووە کە بنکەی دیۆنیسوس بووە. ساڵی ٥٣٩ پ.ز. لە ئاتین بەشداری پێشبڕکێی شانۆگەری کردووە، بەڵام بەرهەمەکانی هیچیان نەماون. پێویستە ئەوەمان لەبەرچاوبێ کە جیاوازی لەنێوان ژمارەی ئەکتەری سەرشانۆو ژمارەی ئەو کەسانەی ئەکتەرەکان دەیاننوێنن هەیە، وادەبوو ئەکتەرێك بەهۆی ڕووبەندو جل وبەرگی جۆراوجۆرەوە دەوری چەند کەسێك بگێڕێ.

٢٢-هەندێ توێژەرەوە ڕایان وایە نەخش و نیگاری دیمەنەکان لە داهێنانی سۆفۆکلیس نییە، بەڵکو وردە وردە لە شانۆگەری یۆنانیدا سەری هەڵداوە گەشەی کردووە.

٢٣-بۆ ساتۆرەکان دەگەڕێتەوە. ئەمانە مجێوری دیۆنیسوس و ڕۆحی لێڕو چیاو پیت و بەرەکەت بوون. ساتور بەشێوەیەکی سەیرو سەمەرە پێشان دراوە. لەشێوەی مرۆڤدایە بەڵام ئەندامی گیاندارەکانی تری بۆ داندراوە، وەکو کلکی ئەسپ و قاچی بزن...بەرگیان هەمووی سووربوو، قۆچی بچووکیان هەبوو، خۆش مەشرەب و گاڵتەجاڕبوون. حەزیان لە ڕابواردن و شادی و بەزم و خۆشی بوو.

وا باوبوو شاعیری تراجیدی دەبوایە لە پێشبڕکێدا سێ تراجیدیا لە شانۆگەرییەکی کورتی ساتوری پێشکەش بکا، یەك تاکە شانۆگەری ساتوری ماوە، ئەویش (کیکلویس)ی یوریپیدیسە.

٢٤-تروکاسـی واتـە تروکـی، جـۆرە کێـشێکە لـە بڕگەیـەکی درێـژو بڕگەیەکی کورت پێك دێ (—ب).

٢٥-ئـەیامبی لـە ئـەیامبوس هـاتووە، وەکـو لـە پـەراوێزێکی تـر بـاس کراوە، شیعرێك بووە کێشەکەی لە بڕگەیەکی کورت و بڕگەیەکی درێژ(ب-) پێك هاتووە، واتـە لـەڕووی بڕگـەوە پێچەوانەی (تروکی)یە، ئەم کێشی ئەیامبییە بەزۆری بۆ داشۆرین بەکارهاتووە.

# پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم

١- لەبەشی یەکەمدا

٢-لەیۆنانیدا، یەك وشە بۆ (ناشیرینی)و (خراپی) بەکاردێ. شاعیر لێرەدا تەنیا روو دەکاتە لایەنی (ناشیرینی) کەمایەی پێکەنین و سووکایەتیبێ. بەم جۆرە نووسەری کۆمیدی هەستی بەزەییو میهرەبانی لای تەماشاکەران نابزوێنێ کە ئەمە تایبەتە بە تراجیدی بەڵکو ئەو هەستەیان لا دەوروژێنێ کە ئەو جۆرە کەسە گێلۆکەن و شایانی سووکایەتین.

٣-(ئەفلاتوون)یش لە (فیلایوس)دا دەڵێ: نەزانین بۆ ئەوەی پێکەنین بروژێنێ نابێ ئازاری کەسانی تری تێدابێ.

٤-ڕووبەند: ئەو نیقابەیەکە ئەکتەرەکان بەسەر دەمو چاوی خۆیاندا هەڵدەکێشن، وێنەی جیاجیای لەسەر دەکێشرا، ڕووبەندی تراجیدی ترسناكو ڕووبەندی کۆمیدی گاڵتە ئامێزە.

تێبینی:

لە کوردیدا زۆرجار هەر (ماسك-Mask)یان دەمامك بەکارهاتووە. من پێم وایە ئەمە دەمامك ناگرێتەوە چونکە دەمامك دەموچاو داناپۆشێ تەنیا سەرو پشتەسەرو لاجانگو گوێچکەکان دادەپۆشێ، وشەی (ماسك) یش بیانیەو پێویست بە خواستنی ئەو جۆرە وشەیە ناکات مادام لە کوردیدا وشەی خۆمان هەبێ. ڕووبەند پڕ پێستی ئەمەیە و لە شیعری کلاسیکی کوردیدا زۆر بەکارهاتووە: (ڕووبەندی ماهی لادا).

٥-کۆمیدی لاساکردنەوەی کردەوەی جۆرە کەسێکە کە لەئاستی گشتی نزمترە، ئەم نزمییە لەمانای ناشیرینیو کەمو کورتی لایەنی روخسارو ئازارو رەفتاردا دەردەکەوێ، بەڵام ئەم کەموکورتییە نابێ بگاتە رادەی ئازارو دڵتەنگی بۆ تەماشاکەرەکان، بۆ نموونە، ئەو رووبەندەیشێوانو زێدەرەوی لە روخساری بنیادەم تێدایە خەڵك دەخاتە پێکەنین بەڵام سۆزو خەم نارووژێنێ.

٦-ئەرکۆن-ئارخۆن: قازییەکی پایەداری شاری ئاتین بوو لە یۆنانی کۆندا، پاشان ئەو ئارکۆنە-قازییە-ئەرکو دەسەڵاتی خۆی بەسەر (نۆ) ئارکۆندا دابەش کرد کە ئیشەکان بەرێوەببەن. یەکێ لەم ئارکۆنانە ئیشی بەرێوەبردنی کاروباری ئاینی بوو، هەروەهاکاروباری شانۆگەرییەکانی ئاهەنگی دیۆنیسویشی رێك دەخست، یەکێ لە ئەرکەکانی ئەم ئارکۆنە ئەوەبوو کە شاعیرەکان ساڵانە بەرهەمی شانۆیی خۆیان بۆ پێشبرکێ پێشکەش دەکرد، ئەم بەرهەمی سێ شاعیری دەست نیشان دەکردو کۆرسی هەڵدەبژارد، خەرجی دەرهێنانو پێشکەشکردنی شانۆگەرییەکان لەسەر حیسابی خەڵکەکە بوو، هەر ئارکۆنیش بوو باروبووکەرەکانی دیاردەکرد کە وەکوو خزمەتێکی ئاینی پارەکەیان دەدا.

٧-لەتۆماری خەڵاتکراوەکانی ئاهەنگەکانی دیۆنیسوس دا دەردەکەوێ کە پێش ساڵی ٤٥٨ پ.ز کۆمیدی رەسمی هەبووە کە دەوڵەت دانی پێدا ناوە ئەویش بەوەی کە ساڵی ٤٨٧ پ.ز کۆرسی داوە بە کۆمیدی.

٨-بەربێژ-Prologue : پێشەکییەك بوو، پێش دەست پێکردنی نواندن هەندێ لایەنی شانۆگەرییەکانی بۆ تەماشاکەرەکان روون دەکردەوە.

٩ فۆرمیس: شاعیرێ بووە لەسەدەی (٥)ی پ.ز ژیاوە. ئەرەستۆ بە داهێنەری کۆمیدی دادەنێ، کەچی هەندێکی تر بە مامۆستای تراجیدی دەزانن، نووسەرێکی (دۆری) هاوچەرخی (ئیپیخارمس) بوو، (سویداس) ناوی حەفت شانۆگەری فۆرمیسی هێناوە، ئێستا هیچیان نەماون، لەناوی شانۆگەرییەکانەوە دەردەکەوێ کەرەستەکانی هەمووی ئەفسانەیی بوون.

١٠-کرێتیس: شاعیرێکی کۆمیدی ئاتینی بوو، یەکەم کەس بوو داشۆرینی کەسێتی وەکوو بابەتێکی پێکەنین نایەلاوە، ناوی شەش حەوت شانۆگەری دەدەنە پاڵ، دەوری ساڵی ٤٢٤ پ.ز کۆچی دوایی کردووە.

١١-ئەرەستۆ: لە (هونەری شیعر)دا تەنیا لێرەدا ئاماژە بۆ (یەکێتی کات) دەکات کە ماوەی تراجیدی بەیەک سووڕی خۆر دیارکراوە. (چینتسیۆ)و (کاستل ڤیترۆ)و (روبرتلی)و (تریسینۆ) و رەخنەگردکانی تری سەردەمی ڕاپەڕین (یەکێتی کات) یان لەم قسەیەوە وەرگرتووە. ئەرەستۆ لەباسی ڕەگەزە بنچینەیەکانی تراجیدی لای ئێمەکردۆتەوەو بەپێویستی نەزانیوە وەکوو یاسا باسی نەکردووە، بەلام لێرەدا کە باسی تێبینی گشتی دەکا لای شاعیرە نوێیەکانی سەردەمی خۆی، هەستی پێکردووە، یەکێتی دووەمیش کە (یەکێتی شوێن)ە کاستل ڤیترۆ باسی کردووە کە دەبێ ڕووداوەکانی شانۆگەرییەکە لەیەک شوێن، یان لەیەک شاردا بقەومێن، یەکێتی سێیەمیش کە (یەکێتی ڕووداو)ە ئەرەستۆ بەئاشکرا داوای پەیڕەوکردنی کردووەو بەمەرج و پێویستی داناوە.

١٢-زۆربەی تۆژەرەوان لەمەوە وای بۆ دەچن کە ئەرەستۆ دەبێ کتێبێکی سەربەخۆ، یان باسێکی فراوانی لە دوای (هونەری شیعر) لەبارەی (هونەری کۆمیدی) هەبێ و لەوانەیە لەناوچووبێ.

# پەراوێزەکانی بەشی شەشەم

١-باسی کۆمیدی نەماوە کە دەبوایە بابەتی دووەمی (هونەری شیعر)بوایە.

٢-ئەم پێناسەیەی ئەرەستۆ بۆ تراجیدی، کە بەدرێژایی سەدەکانی رابردوو تا ئێستا ڕێ نیشاندەری تۆژەرەوانی ئەم هونەرە درامییە بووە، لە هەموو جۆرەکانی تری شیعر جیایە، جیاوازییەکە لە چوار ڕەگەزی بنەڕەتی دایە کە تراجیدی پێك دێنن:

ا -بابەتی لاسایکردنەوە-کردەوەی خەڵك

ب -کەرەستەی لاسایکردنەوە-زمانی تایبەت

ج-ڕێگاو شێوازی لاسایکردنەوە-پێشکەشکردنی ڕاستەوخۆی درامی

د-ئامانجی لاسایکردنەوە-پاکبوونەوە لە هەردوو سۆزی (ترس)و (بەزەیی)

٣-کردەوە (Paraxis) بەلای ئەرەستۆ دوو هۆی هەیە: کەسێتی و هزر.

کەسێتی: کەسێتی مرۆڤ بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنێ کە کردەوەیەکی تایبەتی ئەنجام بدا، ئەو تەنیا ئەو کردەوانە دەکا کە لەگەڵ بارودۆخی ژیانی خۆی دەگونجێ.

هزر: هزردکەشی ڕێی نیشان دەدا لە هەر هەڵویستێکا، چی هەڵبژێرێ و خۆی لەچی دووربخاتەوە.

کەواتە هزرو کەسێتی بەیەکەوە کردەوەی مرۆڤ پێك دێنن. لەبارەی چۆنیەتی لاسایی‌کردنەوەی کردەوەش، لەڕاستیدا کردەوە هەر تەنیا کاروڕوداوو چالاکی مرۆڤ نییەو بەس، بەڵکو بزوێنەرەکانی پشت ئەم کاروچالاکیانەشە. ناسینی کەسەکانی شانۆگەری هەر تەنیابە وەسف و گێڕانەوە نایەتەدی، بەڵکو لەڕێی ئەو کارو ڕووداوانەش دەبێ کە دەیانکاو بەسەری دێ، بۆیە ئەگەر شیعری درامی کردەوەی تێدانەبێ، بە دراما دانانرێ.

٤- سەنگینی ئاماژەیە بۆ پێچەوانەی گاڵتەجاڕی. وشەکە لەیۆنانیدا (Spoudaias)و دژی کۆمیدیە، بۆیە هەندێ بە (بەرز، مەزن، گرنگ) لێکیان داوەتەوە.

٥-تەواو: واتە بایی خۆی ڕووداوی درامی تێدابێ، ڕووداوەکان لەناو خۆیانەوە کارێکی تەواو پێك بێنن، واتە سەرەتاو ناوەڕاستو کۆتایی هەبێ‌و هۆی کاریگەری تراجیدیشی تێدابێ.

٦-درێژی لێرەدا ئاماژەیە بۆ ڕووبەر، یان قەبارە، یان درێژبوونەوەی مەوادی تراجیدی کە بواری گەشەسەندنی ڕووداوێکی سەنگین بدا.

٧-زمانی تراجیدی زمانێکی چێژ بەخشە، چونکە زمانێکی ڕازاوەو کێشدارە، لەقاڵبی گفتوگۆدایەو ئاوازو مۆسیقایەکی تایبەتی تێدایە.

٨-دراما لە بنچینەدا بریتییە لە لاساکردنەوەی کردەوە کە ئەکتەر لەسەرشانۆ پێشانی دەدەن، کەچی هونەرەکانی تری وەکو داستان‌و شیعری دیترامبی گێڕانەوەیان تێدا بەکاردێ چونکە ئەمانە هەر بەسروشت پێویستیان بە خەبەرو وەسف و گێڕانەوەیە.

٩-ئەمە پێناسەی ئەرەستۆیە بۆ تراجیدی‌و بەم جۆرە لێك دەدرێتەوە:

-لاسای‌کردنەوەی کردەوەیەکی بەرزە

-یەك پارچەی ئۆرگانی تەواوە

-درێژاییەکی دیاری هەیە

- جۆرە ڕازاندنەوەیەکی تایبەتی هەیە

-کەسانێکی تێدایە لەباری کردەوە نواندندان

-دوو سۆزی تێدایە پشت بەیەکتر دەبەستن و دەبن بەهۆی پاکبوونەوە.

پاکبونەوە – Katharsisi

لەبارەی مانا و سروشت و چۆنیەتی پاکبوونەوە، گفتوگۆیەکی زۆر لەناو تۆژەرەوەکان هەیە. ئەمە یەکێکە لەو زاراوانەی کە جێگای گەنگەشەو مشت و مڕێکی زۆر بووە. مەبەست لە پاکبوونەوە، پاکبونەوەی دەروونە لە دوو سۆزی (ترس) و (بەزەیی) بەهۆی پێشاندانی کاری تراجیدییەوە.

بەزەیی: ئەو سۆزەیە کە بەرامبەر کەسێکی وەکو خۆمان هەستی پێدەکەین کەتووشی بەڵایەك ، یان مەینەتییەك هاتبێ، بەڵام شیاوی ئەو بەڵاو مەینەتییە نەبێ.

ترس: ئەو سۆزەیە کەبەرامبەر کەسێکی وەکوو خۆمان هەستی پێدەکەین کە بەختەوەریی، یان ژیانی، بکەوێتە بەر مەترسی هەڕەشەیەکی گەورەوەو ئارامی دەروونی بکەوێتە شڵەژان. ترس کەرەستەی بەزەییە. هیچ بەزەییەك بەبێ ترس پەیدا نابێت، ترس و بەزەیی وەکو دوو هۆکاری بەهێز تەماشاکەران دەخەنە حاڵەتی دورکەوتنەوەو نزیکبوونەوە، ترسەکە لە شانۆ دووری دەخاتەوەو بەزەییەکە بەرەو شانۆ ڕایدەکێشێ و نزیکی دەکاتەوە؛ ئەم دوورکەوتنەوەو نزیك کەوتنەوەیە تەماشاکەرەکان دەخاتە بارێکی دەروونی تایبەتییەوە.

١٠-واتەلە گفتەگۆ(دیالۆگ) کێش و لە کۆرس سروود.

١١- واتە بەشەکانی تراجیدی لەڕووی نواندنەوە ئەمانەن:

ا-دیمەنەکانی سەرشانۆ

ب-مۆسیقاو سروود

ج-ئیلقا یان ئاخاوتن

د-چنین (میتۆس)

ه-رەوشت

و- بیر(هزر)

سێیەکی پێشەوە ڕەگەزی دەرەکین، پەیوەندییان بە ئەکتەرو نواندنەوە هەیە، سێیەکی دواوەش ناوەکین، پەیوەندیان بە نووسەرو شانۆگەرییەوە هەیە.

١٢-ئەمە لە (هونەری گوتار) یشدا هاتووە.

١٣-چنین (Mythos- plot) کە هەندێ بە گرێ و هەندێ بە خەرافەو هەندێ بە ناوەرۆك لێکیان داوەتەوە، لە بنیاتی درامیدا لە هەموو بەشەکانی تر گرنگترە. چنین لە کردەوەو بیرکردنەوەو هەست و نەستی کەسەکان دروست دەبێ، هەموو شانۆگەرییەك چنینی هەیە بەو مانایەی کە چنین ریزە ڕووداوێکە بە پەیوەندی هۆو ئەنجام بەیەکەوە بەسراونەتەوە.

١٤-کەسێتی: لە یۆنانیدا (Ethos) کە مانای کەسێتی، یان ڕەوشت دەدا، لای ئەرەستۆ بەمانای ئەو ڕەوشتەیە کە کەسێتی دروست دەکار خواست و بڕیارەکانی دەست نیشان دەکات. تراجیدی لە بنچینەدا پێشاندانی وێنەی کەسەکان نییە، بەڵکو لاسایکردنەوەی کردەوەی

کەسەکانە، بۆیە لە تراجیدی دا، کردەوە لە کەسێتی گرنگترە چونکە هەر کردەوەیەکە، کەسێتی دروست دەکات.

١٥-دارشتن، یان زمان: شاعیری شانۆگەری بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ وشە (Lexis) دەکا کە هۆیەکی بنچینەییە بۆ بەرهەم هێنانی کاری هونەری. وشە لەناو فەرهەنگی زماندا پەرت و بلاوە، هەموو کەس دەستی پێ رادەگا، بەلام نووسەرو شاعیر دەتوانن بەشێوەیەکی داهێنەرانە وشە هەلبژێرن و بەشێوەی تایبەتی وشەکان رێك بخەن و زمانی درامی پێش هەموو شتێ دەبێ روون و ئاشکرابێ.

١٦-هزر (Dianora) ئەو رەگەزە زەینییەیە کە لە هەڵس و کەوتی ماقوڵدا خۆی دەنوێنێ و هەر بەهۆی هزرەوە کەسێتی قاڵبی هەستی دەرەوە وەردەگرێ، واتە هزر لە شانۆگەریدا بریتییە لە گفتارو رەفتاری کەسەکان.

١٧-دیمەن(Opsis) هەر رەگەزێکی شانۆییە، کە لەسەردەپی شانۆدا بکەوێتە بەرچاو، وەکوو: دیمەنی گشتی، کەلوپەل، جلوبەرگ، روناکی....

بەلای ئەرەستۆوە دیمەنی شانۆیی لە هەموو بەشەکانی، تری پێکهاتەی کاری درامی بێ بایەخترە.

١٨-گۆرانی (Melos) شانۆگەری بۆ نواندن و گوتن دەنووسرێ، بۆیە دەبێ بایەخی زۆر بەلایەنی دەنگ و ئاوازی دەنگ و وشەکان بدرێ، هەردێرێك شوێنی بەرزو نزم و شوێنی هێدی کردنەوەو خێرایی خۆی تێدایە، ئەمەش دەوری خۆی لە گەیاندنی مانا و کارکردنەسەر تەماشاکەران هەیە.

١٩-زیوکسیس: نیگارکێشێکی ناوداری یۆنانی کۆن بوو، خەڵکی (هیراکلیا)ی باشووری ئیتالیا بوو. هاوچەرخی سوکرات و شاگردی ئاسیۆسی تاسوسی بوو. لە گفتوگۆی (پرۆتاگۆراس)ی ئەفلاتوندا وەکو گەنجێ وایە تازە هاتۆتە ئاتێن. زیوکسیس لە نیگارکێشانی رووخساری ژن و منداڵان و لەبەرجەستە کردنی دیمەنی بارۆک و دیمەنی سەر بە بنەماڵە گەورەکان توانایەکی زۆری هەبوو،ساڵی ٤٠٦ نیگاری (ئەلکمینا)ی کچی (ئاراگۆس) پاشای کێشاوە، ساڵی ٤١٣ نیگارەکانی کۆشکی (ئەرخیلوس)ی کێشا، زۆر راست و دەستپاك بوو لە نیگارکێشاندا، نیگاری شتەکانی دەق وەکو خۆی دەکێشا، دەڵێن هێشوی ترێی وای کێشاوە باڵندەی پێ تەفرەداوە.

٢٠-لەبەشی (دە) و (یازدە)دا، باسی ئەم دودیاردەیە هاتووە.

٢١- بەلای ئەرەستۆوە چنین لە کەسێتی گرنگترە، ئەو لای وایە تراجیدی، بەبێ سیمای بنچینەیی کەسێتی، دەبێ، بەڵام بەبێ چنین نابێ ئەو چنین بەهێڵی بنچینەیی وێنە دەچوێنێ، چۆن رەنگ خۆی لە خۆیەوە جوانە، بەڵام ئەگەر نەکەوێتە چوارچێوەی ئەو هێڵە بنچینەییانەوە هیچ مانا و دەلالەتێکی نابێ؛ هەر بەو جۆرەش شانۆگەری تراجیدی بەبێ چنین هیچ مانای نییە.

٢٢- مەبەستی نوێخوازەکان، بەتایبەتی یۆریپیدیسە ئەگەرچی هاوچەرخی خۆیشی نەبووە.

٢٣-مەبەستی لە مۆسیقا، یان لایەنی مۆسیقی تراجیدییە؛ کە بریتیە لە سرودەکانی کۆرس. ئەمە بەڵگەیەکی ترە کە مۆسیقا پایەیەکی بەرز سەرەکی لە تراجیدی دا هەیە.

# پەراوێزەکانی بەشی حەوتەم

(١) تێکچڕژانی چنین بەجۆرێکی ئۆرگانی بەدەستووری (ناچاری‌و شیاوی) بەسراوەتەوە. هەر تەنیا لاسای‌کردەوەیەک ناکاتەوە کە رووی دابێ‌و برابێتەوە، بەڵکو بۆی هەیە لاسای کردەوەیەک بکاتەوە کەبشێ ڕوربدا، یا ڕوودانی شتێکی ناچاری بێ لەچوارچێوەی بارودۆخێکی تایبەتیدا.

(٢) ئەرەستۆ لەبەشی پێشوودا باسی درێژی تراجیدی کرد، لێرە دووبارە دەگەڕێتەوە سەری . لای ئەو چنین دەبێ خاوەنی قەبارەیەکی دیاریکراو بێ، واتە درێژبوونەوەی بۆ مەودایەکی تایبەتی بێ. نابێ نەزۆر درێژ بێ‌و نەزۆر کورت. ئەگەر زۆر درێژ بێ زەین ناتوانێ هەمووی وەربگرێ‌و پێش گەیشتنە کۆتایی سەرەتاکەی لەبیر دەکا، ئەگەر زۆر کورتیش بێ زەحمەتە لەو ماوە کورتەدا شاعیر بتوانێ ئەو ڕووداوانە پێشکەش بکا کەگۆڕینی چارەنووسی پاڵەوانەکەیان بەدەمەوەیە، هەروەها بەڕوونی بەشە جیاجیاکان پێشکەش بکا.

درێژیی پەسند ئەوەیە کەلەگەڵ (یەکێتی ڕووداو)ەکەدا بگونجێ : بایی ئەوە هەبێ کردەوەی گۆڕانی چارەنووسی پاڵەوانەکە بەڕێکی گەشە بکات‌و بەشەکانی ڕووداوەکەی ڕێک‌و رەوان بێ‌و پەیوەندی بەشەکان لۆجیکی بێ‌و سەراپای هاوسەنگ بێ.

(٢)لەئاهەنگـــەکانی دیونیـــسوس، هـــەرجارەی ســـێ شـــانۆگەری و ساتۆرییەك پێشکەش دەکرا کەماوەی ٨-١٠ سەعاتی دەخایاند.

دیارنییە داخۆ درێژی شانۆگەری تراجیدی بە(کاتژمێری ئاوی) دەپێورا، یان نا؟ بەڵام ئەرەستۆ کەلێرەدا باسی (١٠٠) دەکات لەوە ناکات زۆر ورد بێ، رەنگە بەگاڵتە وابڵێ و ئەمە لەناو خەڵك وەکوو نوکتەی لێ هاتبێ.

# پەراوێزەکانی بەشی هەشتەم

(١) هیراکلیاد: واتە، هیراکلنامە (هەرقەلنامە). واتە باسی رووداوو بەسەرهاتەکانی هەرقەل. هەرقەل بەهێزترینو بەناوبانگترین پاڵەوانی یۆنانی کۆن بوو. هەرقەل کوڕی (ئەمفتریۆن) و (ئەلکمینا) بوو، لەبنچینەدا خۆی ناوی (ئەلیسیدس) بوو، بەناوی (ئەلسیوس) ی باپیرەیەوە کرابوو، دەڵێن ئەلیسیدیس کەهەموو کوڕەکانی خۆی لە(میگارا) کوشت، چووە لای کاهین (بیتیا)ی غەیبگۆی (ئەپۆلۆ)

بۆ ئەوەی خۆی لەو تاوانە پاك بکاتەوە. ئەویش ئامۆژگاری کرد ناوی هەرقەل لەخۆی بنێ، کەمانای (شکۆی هیرا) دەدات. هیرا ژنی زیوس بوو، ئیتر هەر بەو ناوە مایەوە.

راستە هەرقەل بەناو کوڕی (ئەمفتریۆن) بوو، بەڵام باوکی راستەقینەی خۆی زیوسی خوای هەرە گەورەی یۆنان بوو، چونکە کاتێ کەئەمفتریۆس چووبووە جەنگی خەڵکی (تیلیبۆیا)، زیوس خۆی خستە سەر شکڵی (ئەمفتریۆن) و چوو لەگەڵ ئەلکمینا نووستو ئەلکما لەمەوە هەرقەلی بەزگی کەوت. بۆ بەیانی (ئەمفتریۆن) هاتەوە، ئەویش چوو لەگەڵ ژنەکەی نووستو لەمەوەش (ئیفیکلیس) ی بەزکی کەوت کەجمکی هەرقەل بوو، تەنیا یەك شەو لەو بچووکتر بوو.

دەڵێن کاتێ ئەلکمینا هەرقەلی بوو، هیرای ژنی زیوس ئێرەیی پێ بردو دوو ماری نارد بۆئەوەی لەناو بێشکەدا بەهەرقەل وەبدەنو

بیکوژن، بەڵام هەرقەل مارەکانی گرت و توند رایگوشین و تا مردن بەری نەدان

زۆر ئەفسانەی جیاجیا لەبارەی هەرقەل نووسراوە:

١- دەوری دوازدە (کردەوەکە) . ئەو کردەوانە، خۆی بەتەنیا، یان لەگەڵ (ئەیولاس)ی برازای ئەنجامی داون.

ب ــ گیانبازییەکانی دەردوەی دوازدە کردەوەکە. وەکوو ئەو هێرشانەی خۆی سەرکردایەتی کردوون.

ج ــ گیانبازیی لاوەکی کەلەکاتی ئەنجامدانی دوازدە کردەوەکە بەرەو رووی بوونەتەوە.

دوازدە کردەوە بەناوبانگەکەی هەرقەل ئەوەبوو دونیای لەهەندێ شت و دڕندەی دڕو بەدکار پاك کردەوە، کەئەمانە بوون:

١- شێری نیمیا ٢- ماری لیرنا ٣- بەرازی ئێریمانتوس ٤- مامزی کرینیا ٥- باڵندەکانی گۆلی ستیمفالۆس ٦- تەویلەکانی ئوگیاس پاشا ٧ ـ (گا)ی کریتی ٨ ـ ئەسپەکانی دیومیدیس ٩- زناری هیپولیتای شاژن ١٠. گوێرەکەکانی گیریۆن ١١- سەگەکەی کەربەروس ١٢- سێوی زێڕین لەهەسپەریدس.

چەند شاعیرێکی کۆن داستانیان لەبارەی پاڵەوانێتی هەرقەل نووسیوە، وەکوو : (ستاتون)ی خەڵکی (لاکدامون)و (بابی ئەسیس)ی خەڵکی (هەلیکارناناسوس).

٢- تسیوسیاد : (تسیوس) کوڕی (ئیگیوس)، یان (پۆزێدون)ی خوای دەریا بووە.

پاڵەوانێکی نەتەوایەتی ئاتین بوو. هێشتا منداڵ بوو، باوکی ڕۆیشت و بە(ئیترا)ی ژنی گوت کەکوڕەکەیان گەورەبوو و پێ ڕاگەیشت.

داوای لیٚ بکا، بچیٚ ئەو بەردە بەرز بکاتەوە کە شیرو پیٚلاویٚکی لەبن شاردبووەوە. تیسیوس کەتەمەنی گەیشتە شازدە سالٚی، بەبیٚ زەحمەت و مشەققەت، بەردەکەی بەرزکردەوەو بریاری دا بچیٚتە دوای تاقیبی باوکی لەئاتین، بەلاٚم بەریٚگای دەریادا نا، بەلکو بەریٚگای بەژوو شکاتیدا کەپر مەترسی بوو. لەریٚگادا تووشی زۆر پیاوی بەدکارو درِندە هات و بەسەریان دا زالٚ بوو. (تسیوس) دوای باوکی، بوو بەپاشاو (ئەتیکا)ی کرد بەدەولەت و لەگەلٚ هەرقەل، بەهاوپەیمانی، پەلاماری ئەمازۆکانیان دا. (تسیوس) یەکیٚ بوو لەوانەی یارمەتی (میلیاگەر)ی دا بۆ راوکردنی بەرازی کیٚوی و یەکیٚ بوو لەدەریاوانەکانی ئەرگو و هەر ئەویش بوو جەنازەی حەفت یاخییەکانی (تیبە)ی ناشت.

(٣) پرناس: پارناس (پارناسوس) چیایەکە کە لەزنجیرەی (پندوس) بەرەو باشووری رۆژهەلاٚت دریٚژ دەبیٚتەوە. بەرزی ٨٢٠٠ پیٚیە. دۆلٚی (سفیسوس)و دۆلٚی (ئەمفیسا) لەیەك جیا دەکاتەوە. تا کەنداوی (کورینت)ی لای زمانەی (نۆپوس) دریٚژ دەبیٚتەوە. بەردەکەی قسلە، چیایەکی رووتانە بەلاٚم دامیٚنەکانی بە ئاوە، شارەکانی (فۆکیس)و دەشتی (کریزا) کەوتوونەتە دامیٚنی رۆژهەلاٚتی لای خوارەوەی دۆلٚی (دەلفی)یە. پارناس کاتی خۆی چیایەکی پیرۆز بووە بەتایبەتی لای (دۆری)یەکان. چیاکە بەناوی (پارناسوس) کراوە کە پالەوانیٚکی ئەفسانەیی بووە، دەلیٚن کوری حوورییەك بووە بەناوی (کلیۆدۆرا) لە (پۆزایدۆن)ی میٚردی کە خوای دەریا بووە. هەروەها دەلیٚن باوکی ئەم پالەوانە بنیادەم بووەو ناوی (کلیۆدۆمپۆس) بووە. پارناسوس پەرستگای (پیتۆ)ی ناوداری دروست کردو پاشان (ئەپۆلۆ) ئەو پەرستگایەی

داگیرکرد کەخوای شیعرو کشتوکاڵو رۆژو پێشبینی بوو. (ئەپۆلۆ) بوو غەیبگۆی داهێنا. چیای پارناسو حەرەمی (ئەپۆلۆ)یە، بۆیە چیای شیعرو شاعیرانە.

(٤) (ئۆدیسیوس) لەکاتی راووشکاردا، لەگەڵ (ئۆتۆلۆلۆکوس) ی باپیرەی لەسەر چیای (پرناس) بەقەپی بەرازێکی کێوی بریندار بوو. لە چیرۆکی (ئۆدیسە)دا باس دەکا کەئەم جێ برینە دەبێ بەهۆی ئەوە کە (ئویراکلیا) لەکاتی شووشتنی قاچەکانی، بیناسێتەوە.

(٥) کاتێ گریکەکان خۆیان بۆ چۆڵ کردنی (ئۆلیس) تەیار کرد، دەڵێن ئۆدیسوس خۆی شێت کرد بۆئەوەی بەشداری شەڕ نەکا، بەڵام (فالامیدس) حیلەکەی ئاشکرا کرد.

## پەراوێزەکانی بەشی نۆیەم:

(١) ئەرەستۆ لەبەشی یەکەمدا باسی کردووە کە شاعیر هەر تەنیا بەوە نابێ بەشاعیر کە کێش بەکاربێنێ.

(٢) هیرۆدۆتس: باوکی مێژوونووسانە. دەوری ساڵی ٤٨٤ پ.ز لە (هیکارباسوس) لە ئاسیای بچووك لەدایك بووە. لەوێوە چۆتە (ساموس)و لەوێشەوە بۆ ئاتین. چەند گەشتێکی بۆ میسرو ئەوروپای رۆژهەڵات و ئاسیا کردووە، لەبارەی شەڕی یۆنانی– فارسی نووسیوە. زۆر تێبینی وردی لەبارەی میسر تۆمارکردووە. ساڵی ٤٢٠ پ.ز لە (تورتی) باشووری ئیتالیا کۆچی دوایی کرد.

(٣) مێژوو بەو مانایە گێڕانەوەی رووداوەکانە بێ ئەوەی فەلسەفەی ئەو دیو رووداوەکان شی بکاتەوە، بەو مانایە شیعر لە مێژوو، بالاترە چونکە شتی گشتی لە شتی پارچەیی بەرزو بالاترە.

(٤) ناونانی کەسەکان مەبەست ئەوە نییە کەسی وابن کە هەر بەڕاستی هەبن. شیعریش دەتوانێ ناوی گشتی بەکاربێنێ، بەلام لە شیعردا ناو ڕەمزو نموونەی گشتییە.

(٥) ئەلکیبیادیس (٤٥٠–٤٠٤ پ.ز) لەپیاوە گەورەکانی دەوڵەت بوو لە ئاتین. توانی بەبەهرەی خۆی ببێ بە سەرکردەی دیموکراتییە زیدەڕەوەکان. نیازی فراوانخوازی ئەم بوو، بوو بەهۆی ئەوەی ئاتین لەگەڵ (ئەرگۆس)و هەندێ دوژمنی ئەسبرتە بکەوێتە هاوپەیمانی. دزۆر فێڵبازو

خۆپەرست بوو، بەڵایەکی زۆری بەسەر ئاتین هێنا. لەکۆتاییدا بەکوشتن چوو.

(٦) ئاگاتۆن: کوڕی تسیمانوس بوو. شاعیرێکی تراجیدی ئاتین بوو، یەکەم جار لە ٤١٦ پ.ز کەتەمەنی (٣٠) ساڵی کەمتر بوو، لە ئاهەنگی (لینایا) خەڵاتی یەکەمی وەرگرت. ئەفلاتوون ئەم سەرکەوتنەی کردووە بە یەکێ لە گفتۆگۆکانی (میوانداری). ئەریستوفانیس لە (تیسمۆفۆریازوسای)دا، گاڵتەی پێ کردووە. ساڵی ٤٠٧ پ.ز چووە لای ئەرخیلاوس لە (مەکدونیا)و ساڵی ٤٠١ پ.ز لەوێ کۆچی دوایی کرد لەژێر کاریگەری سوفستاییەکاندا بوو، بەتایبەتی (گۆرگیاس و پرۆدیکوس). بەهرەی داهێنانی لە (ئەنتیوس) دایە کە چیرۆکەکەی هەمووی لە داهێنانی خۆیەتی، لەئەفسانەکانەوە وەری نەگرتووە. ئەم جۆرە داهێنانە، ئەوسا باو نەبووە. لەبەرهەمەکانی تەنیا دەوری (٤٠) دێرێك ماوە. چاکسازی لەسروودی بەکۆمەڵ و پەیژەی مۆسیقادا کردووە.

(٧) تەماشاکەرانی یۆنان ڕاهاتبوون هەر لە پێشەکی، دەیانزانی چ چیرۆکێکە کراوەتە شانۆگەری، بەڵام دیارە ئەمە لەسەدەی ٤ پ.ز کەم بۆتەوە.

(٨) ئەرەستۆ زۆرجار جەخت دەکاتەوە کەدەبێ چنینی دراما یەك پارچەی ئۆرگانی بێ. دەبێ ڕووداوەکان لەناو خۆیانەوە یەکەیەکی توندو پۆڵو یەککگرتوو پێك بێنن. هەر ڕاپسودیەك واتە هەر دیمەنێك و هەر ڕووداوێکی لاوەکی دەبێ لە بینای گشتی بابەتەکە چوورەرە دەربکات.

(٩) ئەم بۆچوونە بەشێوەی جیاجیا لێکدراوەتەوە.

(١٠) شاری (ئارگۆس) دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی نیمچە دوورگەی پلیپۆنیزی یۆنانی. پایتەختی هەرێمی (ئارکۆلیس)ی کۆن بووە.

## پەراوێزی بەشی دەیەم:

(١) چنینی سادە لەچەند رووداوێك پێك دێ كە بەپێی دەستووری (شیان و ناچاری) درووست بوونە. ئەم جۆرە چنینە بە لووسی دەڕوا، هیچ گۆڕانی كت و پڕی تێ ناكەوێ چونكە (وەچەرخان)و (ناسینەوەی) تێدا نییەو هیچ پاكبوونەوەی بەدەمەوە نییە.

گۆڕانی چارەنووسی پاڵەوان، بڕبڕەی پشتی تراجیدییە. ئەودیە پاڵەوانی تراجیدی لەڕەوتی رووداوەكان دا، لە بەدبەختییەوە رەهابێ و بكەوێتە خۆشبەختی، یان لە خۆشبەختییەوە تووشی بەدبەختی ببێ.

(٢) چنینی داڕژاو رەگەزی (وەچەرخان)و (ناسینەوە)ی تێدایەو بەمەوەش ئەوپەڕی پاكبوونەوە دەستەبەر دەكات.

(٤) بۆی هەیە دوو رووداو بەدوای یەكتردا بێن، بەڵام دووەم ئەنجامی یەكەم نەبێ، واتە بەدوای یەكتر هاتنیان بۆ هۆوئەنجام نەگەڕێتەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی یازدەم:

(١) وشـەی (وەچـەرخان – Peripeteia) بـەمانای (گـۆڕان بـەدژی ئاراستە، یان ئامانجێکی دیاریکراو) دێ. بۆی هەیە ڕووداوێکی درامی لەسەرباری ئاسایی خۆی بەرەو ئامانجێکی تایبەتی بڕواو لەپڕ هۆکارێکی دەرەکی کار لەرەوتی ڕووداوەکە بکات و ئاراستەکەی بگۆڕێ، بۆی هەیە ئاراستە تازەکـە پێـچەوانەی ئاراسـتەی یەکـەم بـێ، بۆیـە (وەچەرخان) لەرووی بنیاتـەوە کێشەیەکی درامی دروست دەکات. ئەرەستۆ نموونەی وەچەرخان بە شانۆگەری (ئۆدیب پاشا)ی شاعیری تراجیدی سۆفۆکلیس دێنێتەوە.

(ئۆدیـب) لەشیرەخۆرییەوە دەکەوێتـە مـاڵی پاشای (کۆرنتێ)و لـەوێ گـەورە دەبـێ و هـەروا دەزانـێ (پۆلیپـوس) بـاوکی خۆیـەتی و میرۆپـی دایکیـەتی. کـە غـەیبگۆ وریـای دەکاتـەوە وای لەچـارە نووسـراوە بـاوکی خۆی بکوژێ و زەماوەند لەگەڵ دایکی خۆی بکات، ئەو کە هـەر واتـێ دەگا (پۆلیپوس) باوکی و (میرۆپـێ) دایکییـەتی، لەترسی بەڕاست گەڕانی ئەو پێشبینییە لـەوێ رادەکـات و دەچـێتە شـاری تیبـە. لـەڕێگادا (لایـوس)ی پاشای تیبە دەکوژێ و بێ ئەوەی بزانێ ئەوەیە باوکی ڕاستەقینەی خۆیەتی و لەبـەردەم شـوورەی شـار وەڵامـی پرسـیارەکانی سـفینکیس دەداتـەوەو لەپاداشـتی ئەمـەدا خـەڵکی شـاری تیبـە (جوکاسـتا)ی شـاژنی شـاری لـێ مـارە دەکـەن و دەیکـەن بەپاشـا بـێ ئـەوەی ئۆدیـب بزانـێ ئەمـە دایکی

راستەقینەی خۆیەتی. ئۆدیب ماوەیەکی زۆر بە دادپەروەری فەرمانڕەوایی شاری تیبە دەکا تا تاعون دەکەوێتە ناو شار.

لەو سەروبەندەدا شوانەکەی کۆرنتێ دێتە تیبە، ئەو شوانەی وەختی خۆی ئۆدیبی بەشیرەخۆرەیی لەشوانی تیبە وەرگرتبوو وەدابووی بەپاشای کۆرنتێ بۆ ئەوەی بەخێوی بکەن چونکە هیچ منداڵیان نەبوو. ئەو شوانەی کۆرنتێ دێتە تیبە بۆ ئەوەی ئۆدیب ئاگادار بکاتەوە کە پۆلیپوس پاشا مردووەو بچێ لەوێ ببێ بەپاشا. بەڵام ئۆدیب ئەمە ڕەت دەکاتەوە لەترسی ئەوەی نەوەك بەشی دووەمی پێشبینییەکە بێتەدی کە زەماوەند کردنە لەگەڵ (میرۆپێ)، کەوای دەزانی دایکی خۆیەتی. لێرەدا شوانەکە دەیەوێ ئەو ترسە لەدڵی ئۆدیب دەربکاتو پێی ڕادەگەیەنێ کە ئۆدیب کوڕی ڕاستەقینەی پۆلیپوسو میرۆپێ نییە، هەر ئەوەندەیە ئەوان بەشیرەخۆرەیی وەریان گرتووەو بەخێویان کردووە. ئەم زانیارییەی شوانەکە، دەبێ بەهۆی دۆزینەوەی ڕاستییەکی ترسناك لای ئۆدیب. زانیارییەکە لەباتی ئەوەی دڵەڕاوکێی ئۆدیب بڕەوێنێتەوەو کەیفخۆشی بکاتو وابکات ڕووداوەکان لەسەر ڕەوتی سروشتی خۆیان بەردەوام بن. گۆڕانێکی کتوپڕ لەڕووداوەکان بەرپا دەکات. ئەم (وەچەرخانە)، (ناسینەوەی) تێدایە. ناسینەوەو زانینی ئەوەی کە ئۆدیب کوڕی پاشای کۆرنتێ نییە، بەڵکو کوڕی (لایوس)و (جۆکاستا)یە.

(٢) لونکیوس: تراجیدییەکە، تیۆدیکتیس لەسەدەی چوارەمی پ.ز نووسیویەتی. ئێستا نەماوە.

(٣) (ناسینەوە) بەیۆنانی (Anaggnorisis) مانای دۆزینەوە دەدات. ئەرەستۆ تەنیا بۆ ئەوە بەکاری هێناوە کە کەسێتییەك ڕاستەقینەی کەسێتییەکی تر دەدۆزێتەوە کە پێشتر نەیدەزانی ئەوە. (ناسینەوە)

ئەوەیە کە کەسێتییەك شتێ نازانێ و لای ئاشکرا دەبێ. لای ئەرەستۆ وشەکە بۆ ناسینەوە بەکارهاتووە، واتە کەسێتییەك دوای ماوەیەکی زۆری جیابوونەوەو دوورکەوتنەوەو دابڕان کەسێتیەکی تر دەناسێتەوە.

هۆکارەکانی ناسینەوە، وەك ئەرەستۆ باسی کردوون ئەمانەن:

أ- ناسینەوە بەهۆی نیشانەیەکی لەش، وەکو جێ برینێکی کۆن، یان بەهۆی شتێکی مادی بەرجەستە کە کەسەکە بەکاری دێنێ وەکو ملوانکە، یان مۆمدان، یان زنجیر.

ب- ناسینەوەیەك کە شاعیری درامی بەئەنقەس دەیخاتە سەرزاری ئەو کەسەی دەیەوێ خۆی ئاشکرا بکا. ئەم جۆرە ناسینەوەیە بەلای ئەرەستۆوە شتێکی ناپەسەندە، چونکە ناسینەوەکە لەسروشتی رووداوەکانەوە هەڵنەقوڵاوە.

ج- ناسینەوەی بەهۆی بەبیر هاتنەوە. لەشانۆگەری قوبرسییەکان دا، کە پاڵەوانەکە بەدزی لەتاراوگە دێتەوەو چاوی بە تابلۆی وێنەی باوکی دەکەوێ، کە ببوو بەهۆی دەربەدەربوونی، لەپڕمەی گریان دەدا.

د- ناسینەوە بەهۆی پێوانەی ژیربێژی. ئەرەستۆ نموونەی ئەم ژیربێژییە بەم رستەیە دێنێتەوە: (ئەم پیاوە بەمن دەچێ، تەنیا ئۆریستیش بەمن دەچێ، کەواتە ئەم پیاوە ئۆریستە.)

هـ- ناسینەوەی ئاوێتە. لە ئیستنتاجێکی چەوتەوە دێ لەنێوان دوو کەس، وەکو ئۆدیبوس دەڵێ ئەو کەوانە دەناسمەوە کە نەشمدیوە، کابرای تر پێی بڕوا دەکا کە دەیناسێتەوە.

و- ناسینەوە بەهۆی رووداوەکانەوە. ئەمە بەلای ئەرەستۆوە باشترین جۆری ناسینەوەیە، وەکوو لەشانۆگەری (ئۆدیب پاشا)ی سۆفۆکلیس دا هاتووە.

(٤) لێرەدا خۆشەویستی مانای حەز لێ کردنو عەشق نییە، بەڵکو دۆزینەوەی کەسێکی لەدڵا شیرینە کە خۆشی دەوێ وەکوو ئەوەی باوك کوڕی بزربووی خۆی بەسەر بگرێتەوە، یان خوشکی ونبووی، یان دۆستێکی خۆشەویستی.

(٥) لەشانۆگەری (ئیفجینیا لەتاوریس) کە یەکێکە لەشانۆگەرییەکانی یۆرپیدیس، (ئیفجینیا) نامەیەك دەنووسێو دەیدا بە (بلیادس) بۆئەوەی بیدا بەبرای لەیۆنان بۆئەوەی بێو لەوڵاتی تاوریس رزگاری بکا کەچی ئۆریستو برادەرەکەی لەوێ وەستاون بێ ئەوەی ئیفجینیا بیناسن. لێرەدا بلیادس یەکەو راست نامەکە لەدەست ئۆریست دەنێ بەڵام ئیفجینیا باوەڕناکا ئەمە خۆی بێت، ئیدی ئۆریست ناچار دەبێ بیرەوەری کۆنی لەگەڵ باس بکا بۆ ئەوەی ئیفجینیا بیناسێتەوە، ئەوسا ئیفجینیا خۆی بەباوەشی دادەدا.

ئیفجینیا لە ئەفسانەکانی یۆنان کچی ئەگا مەمنوونە، باوکی فەرماندەی لەشکری یۆنانیان بوو لەجەنگی تەروا دەدا. بۆئەوەی کەشتییەکانی یۆنانیان لەگەرداو رزگار بن ئیفجینیای دایە ئارتمیس بۆئەوەی بیکاتە قوربانی، بەڵام ئارتمیس لەباتی ئیفجینیا مامزێکی کردە قوربانیو ئیفجینیای بردە (تۆرید)و لەوێ کردی بە کاهینی پەرستگای خۆی.

لەهەمان کاتدا ئۆریست بەهۆی گوناهی کوشتنی دایکی بەقسەی غەیبگۆی دەلفی، دەچێتە ئەو وڵاتە، بۆئەوەی پەیکەری (ئارتمیس) ببا. لەوێش رەوشت وابوو هەر بیانییەك بێتە ئەو وڵاتە بیکەن بە قوربانی، جێ بەجێ کردنی ئەم رێو رەسمەش بە ئیفجینیا سپاردرابوو، بەڵام ئیفجینیا برای دەناسێتەوەو رزگاری دەکا.

(٦) پاتۆس (Pathos) واتە بەزەیی بزوێن. ئەم جۆرە کارەساتە وەکو ئەوەی ئۆدیب لەکۆشکی خۆیا دێتە دەرێ بۆ بەردەم جەماوەرو هەردوو چاوی خۆی دەرهێناوەو خوێن بەدەمو چاویدا دێتە خوارێ.

# پەراوێزەکانی بەشی دوازدەم

(١) ئەپیسود کە بەمانای (دیمەنی شانۆیی) هاتووە لەبنەڕەتدا مانای (هاتنە ژوورەوەی ئەکتەر بۆئەوەی شتێ بەکۆرس بڵێ) هاتووە. پاشان مانای بوو بەو دیمەنە شانۆییەی یەك ئەکتەر، یان دوو، لەگەڵ کۆرس پێشکەشی دەکەن.

(٢)تێپەڕین (پارۆدۆس parados) ئەو گۆرانییەیە کە بەدەم هاتنە سەر شانۆی کۆرس دەگوترێ، واتە هاتنی کۆرس و تێپەڕ بوونی بۆسەر دەپی شانۆ.

(٣)جێگرتن ئەو گۆرانییەیە کە کۆرس لەکاتی گەیشتنە سەر شانۆو گرتنی شوێنی خۆیدا دەیچڕێ.

(٤) بۆی هەیە تراجیدی یۆنانی بە بەرپێژ (prologue) دەست پێ بکا کە یەکەمین دیمەنی شانۆییە لەشێوەی گفتوگۆ، یان مەنەلۆگدا. ئەم بەرپێژە پێش دەرکەوتن و هاتنی کۆرس بۆ سەر شانۆ پێکەش دەکرێ شاعیر دەیەوێ بەو بەرپێژە مێشکی تەماشاکەران بۆ شانۆگەرییەکە ئامادە بکاو هەندێ هێڵی سەرەکی و هەندێ رووداو بخاتە روو. هەندێ تراجیدی بەبێ بەرپێژ یەکسەر بە (پارۆدۆس) دەست پێ دەکەن وەکو (فارسەکان)ی ئەسخیلوس.

(٥) وشـه یۆنانییەکـه (epcisodion)ە، مەبەسـت دیمـەنی نوانـدنی تراجیدییە کە رووداوو ئەکتەرەکان پێشکەش دەکا، دەکەوێتە نێوان دوو سروودی کۆرس.

(٦)دەرچـوون (exodos) دوا بەشـی تراجیـدی یۆنانییـە. ئەکتـەرو ئەندامەکانی کۆرس شوێنی خۆیان جێ دێڵن. ئەمە دیمەنی کۆتاییە.

(٧)ئەناپیـست جـۆرە کێـشێکە لـەزەمانی کـۆن لەگـەڵ ئـاوازی جـەنگ دەگونجـا ئەمـە لەشـانۆگەری و بەتایبـەتی لـە (تێپـەڕین)دا دەردەکـەوێ. کێشی ئەناپیست بریتیە لەدوو بڕگەی کورت و بڕگەیەکی درێژ (ب ب –). ئەمـە لەعـەرووزدا بەرامبـەر (فعـولن) دەوەسـتێ و (فعـولن) پێـی دروسـت بوونی کێشی موتەقارییە. ئەم کێشە لەفارسی و کوردیشدا زیاتر بۆ شەڕو پێکدادان بەکاردێ.

(٨)تروکی کێشێکی کۆنە لەبڕگەیەکی درێژو بڕگەیەکی کورت دروست دەبێ (– ب).

# پەراوێزەکانی بەشی سێزدەم

(١) ئەگەر پاڵەوانەکە بەسروشت بەدکاربێ و لە خۆشبەختییەوە بکەوێتە کلۆڵی و بەدبەختی، ئەمە دادپەروەری تێدایە، بۆیە هیچ ترس و بەزەییمان لەلا نابزوێنێ، چونکە تۆڵەی دادپەروەرانە، نەجێی ترسەو نەبەزەیی دەبزوێنێ، بەپێچەوانەوە دەبێ بەهۆی دڵنیایی و دڵنیاییش هەرگیز نابێ بەرەگەزێکی تراجیدی.

(٢) زاراوەی هارماتیا – harmatia یەکێکە لەزاراوە هەرە ئاڵۆزەکانی ئەرەستۆ بەکاری هێناون، مشت و مڕێکی زۆری لەسەر کراوە. ئەوانەی لەم بارەیەوە دواون ئەم مانایانەیان بۆ وشەکە داناوە: (هەڵە/ خلیسک/ خەوش/ گوناه/ کەموکورتی/ مەزندەی ناتەواو/ هەنگاوی چەوت/ خاڵی بێ هێزی..)

پاڵەوانی تراجیدی نەمرۆڤێکی بێ کەم و کورتی وەکو فریشتە وایەو نەمرۆڤێکی هەرە بەدکاریشە، بەڵکو مرۆڤێکی بەڕێزو سەنگین و جددیە تووشی کلۆڵی و بەدبەختی دێ چونکە هەموو لایەنەکانی ئەم گیروگرفتە نازانێ کە بەرەو ڕووی دەبێتەوەو لەئەنجامدا لە حوکمداندا بەهەڵەدا دەچێ، یان مەزندەی تەواو دەرناچێ.

هەڵەی پاڵەوان. بەلای ئەرەستۆوە، بۆ یەکێ لەم هۆیانە دەگەڕێتەوە:

أ- پاڵەوانەکە ئاگاداری بارودۆخێکی تایبەتی، یان ڕاستەقینەیەکی بەرچاو نەبێ.

ب- هەڵەشەیی لە دەربڕینی رای خۆی بەرامبەر بەهەڵوێستێکی تایبەتی. یان کەمتەرخەمی کردن لە گەڵاڵەکردنی وردی ڕاکەی.

جـ- وادەبێ هەڵەکە بەئەنقەس نەکا. بەڵکو بەڕێکەوت بێ وەکو ئەوکارەی لەکاتی توڕەبوون و هەڵچووندا لەدەستی دەردەچێ.

(٣) یەك لایەنی و دوو لایەنی پێوەندی بەکۆتایی تراجیدییەوە هەیە: چیرۆکی یەك لایەنی ئەوەیە کە بەیەك چارەسەر کۆتایی دێ، کەچی چیرۆکی دوولایەنی ئەوەیە کە بەدوو چارەسەر کۆتایی دێ، وەکو کۆتایی دوولایەنی (ئۆدیسوس).

(٤) ئەلکمایۆن لە ئەفسانەی یۆنانیدا کوڕی (ئەمفیاروس) بوو، دایکی ناوی (ئەریفۆلێ) بوو. لەگەڵ ئێپیگۆنییەکان (نەوەکانی حەفت پاڵەوانی تیبە) بەسەرۆکایەتی پۆلینیکسی کوڕی ئۆدیب پەلاماری تیبەیان دا. کە گەڕایەوە بەقسەی باوکی، تۆڵەی باوکی لەدایکی کردەوە، بۆیە (فوری)یەکان وەکو ئۆریستیس، لێرەو لەوێ راویان نا. لە (ئەرکادیا) لەسەر دەستی (فاگیوس) نەختێ خۆی پاك کردەوەو زەماوەندی لەگەڵ کچەکەیدا کردو ملوانکەی (هرمونیا) پێشکەش کرد. بەڵام لەو وڵاتەدا بوو بە خەلاو گرانی، سەری هەڵگرت بۆ ئەوەی بچێتە خاکێك کە دایکی خۆی کوشت رۆژی لێ نەدەدا، ئەم خاك و وڵاتە دورگەیەك بوو لەکلکەی دواوەی رووباری ئەخیلوس، لەوێ زەماوەندی لەگەڵ (کالیرهۆیی)ی کچی (یونیوس)ی پاشای (کالیدون) کرد. کچەکە داوای ملوانکەی هرمونیای لێ کرد ئەویش بەفێڵ لە (فاگیوس)ی سەند. کاتێ (فاگیوس) زانی (ئەلکمایۆن) ئەفرەی داوە، فەرمانی بەکوڕەکانی خۆی کرد بیکوژن ئەوانیش کوشتیان. رۆڵەکانی (ئەکارنان)و (ئەمفیتورس) تۆڵەی باوکی

خۆیان کردەوەو (فاگیوس)و کوڕەکانیان کوشت و ملوانکە شوومەکەیان کرد بە نەزری ئەپۆلۆ لە دەلفی.

(٥) ئۆریستیس کوڕی ئەگا مەمنوون بوو لە (کلیمنسترا)، برای (ئەلیکترا)و (ئیفجینیا)و (کریسۆتمیس) بوو. هێشتا منداڵ بوو دایکی و دۆستەکەی (ئیگنستۆس) باوکیان کوشت، ئەویش کە گەورەبوو لەتۆڵەی باوکی هەردووکی کوشتن. ماوەیەك کەوتە بەر راوەدوونانی خواکانی تۆڵەسەندنەوە پاشان بوو بە پاشای (ئەرگۆس). (نیوتیۆلیموس)ی کوشت و (هرمیۆن)ی کچی (منیلاوس)و (هێلین)ی هێنا، دیارە هێلین ئەو ئافرەتە بوو شەڕی تەروادەی لەسەر هەڵگیرسا.

(٦) (ملیاگیرا) (ملیاگرۆس) کوڕی (یونیوس)ی پاشای (کالیدونیا) بوو، دایکی ناوی (ئەلتیا– ئەلتاکا) بوو. ئەفسانەکە دەڵێ: باوکی سستی کرد لەقوربانی کردن بۆ خواژن (ئەرتەمیس)، ئەویش بەرازێکی کێوی دڕو سەر سەختی لەوڵات بەردا. ملیاگیر راوکەرو تاژییەکانی سەراپای وڵاتی کۆکردەوەو چووە راوی بەرازەکە. لەشانۆگەری (ملیاگیر)ی یۆریپیدیس دا هاتووە کە (ئەتالنتا) یەکەم کەس بوو بەرازەکەی بریندار کرد، لەبەرئەوەی ملیاگیر حەزی لێ دەکرد، کە بەرازەکەی کوشت سەری بەرازەکەی پێشکەش کرد، خاڵۆکانی (بلکیبوس و توکسیوس) لەمە تووڕەبوون و ویستیان (ئەتالنتا)ی لێ بسەنن بەڵام ملیاگیرا لێیان هەڵشاخاو هەردووکی کوشتن. دایکی بەکوژرانی دوو براکەی وەکوو شێتی لێ هات و ملیاگیری کوڕی لەناوبردو لەداخان خۆیشی کوشت.

(٧) تێیسپیس کوڕی (پیلۆپس)و (هیپۆدامیا)و نەوەی (ئەنتالس) بوو. (ئەترویس) برای رازی نەبوو بیکا بە برا بەشی عەرشی (ئەرگوس)، ئەویش لەرقان چوو لەگەڵ (ئایرۆپێ)ی براژنی نووست. کاتێ ئەترویس

بەمەی زانی (ئایرۆپیێ)ی ژنی تەلاق داو (تیسپیس)ی برای سوڕگوم (نفی) کرد. دوای ماوەیەك، بۆئەوەی تۆڵەی ئەو ناپاکییە لەبرای بکاتەوە، لەدووی نارد بێ، لەگەڵی ئاشت دەبێتەوە، لەهەمان کاتدا یەکێ لەکوڕەکانی (تیێسپیس)ی سەربڕی‌و کردیە زیافەت‌و دەرخواردی (تیێسپیس)ی باوکی دا. پاشان کەزیافەتەکە خوراو هەمووشتێ تەواو بوو، (ئەترویس) (تیێسپیسی) برای ئاگادار کردەوە کە گۆشتی جگەرگۆشەی خۆی دەرخوارد داوەو بۆ دڵنیاییش کە لەو پارچەکانی لەبەردەم دانا. تیێسپیس لەوێ رایکرد، دوای ماوەیەك ڕیی کەوتە لای ئەشکەوتی پیرۆزی (مینرفا)و کچێکی دی‌و بەخورتی لاقەی کرد. ئەو کچە کچی (پیلۆپیێیا) بوو، نەشیدەزانی. (ئیگستوس)ی لەو کچە بوو. کە (ئەتریوس) مرد، تیێسپیس گەڕایەوەو بوو بەپاشای میسینا، بەڵام ئەگامەمنوون‌و منیلاوس عەرشەکەیان لێ سەند. ئەگامەمنوون بوو بە پاشای میسینا.

(٨) تێلیفوس کوڕی هەرقەل، بوو دایکی ناوی (ئەوگ) بوو، دەڵێن بەمنداڵی فڕێیان دایە سەر ترۆپکی چیایەك بزنە کێوییەك یان مامزێك فرچکی دایە، شوان هەڵیان گرتەوەو بەخێویان کرد تا پێڕا گەیشت. بوو بە پاشای (موسی)یەکان کەلەشکری یۆنانییەکان بەرەو تەروادە دەچوو لایاندایە وڵاتەکەی ئەم‌و ئەخیلوس لەشەڕێکا بریندار کرد. وەحی بۆ هات برینەکەی تەنیا بەوە چاك دەبێتەوە کە برینداری کردووە، زانی مەبەست رمەکەیە، ئیتر ژەنگی رمەکەی لەسەر برینەکەی داناو چاك بووەوە. یۆریپیدیس شانۆگەرییەکی بەم ناوە نووسیوە.

دەڵێن لەکاتی شەڕی تەروادەدا پێشبینییەك بڵاو بووەوە کە تەروادە ناڕووخێ ئەگەر کوڕێکی هەرقەل هاوکاری نەکا. هەرچەندە تێلیفوس

کچی (پریام)ی پاشای تەروادەی هێنابوو، بەلام لەبەرئەوەی یۆنانییەکان لەبرینێکی غەدار رزگاریان کردبوو، لەگەل یۆنانەکان لەدژی خەنوری جەنگا.

(۹) یۆریپیدیس: کوڕی فیسارکوس بوو. دایکی ناوی (کلتیق) بوو یەکێکە لەسێ تراجیدینووسە گەورەکانی سەدەی (۵) پ.ز. دەوری ٤٨٥ پ.ز لە (سەلامیس) هاتۆتە دونیاوە کە دەوری (٦٠) میل لەباکوری رۆژهەلاتی ئاتین دوورە. ماوەیەك بەتەنیا لە ئەشکەوتێکی سەر کەناری دەریا دەژیاو خەریکی بیر کردنەوە بوو.دەلێن شاگردی (ئەناکساگۆراس)ی فەیلەسووف بووە، شیعرو فەلسەفەی خوێندووەو خەریکی نیگارو وەرزش بووە. لەئاخرو ئۆخری ژیانی زۆر برادەری فەیلەسووفەکانی ئەو سەردەمە بووە وەکوو ئەرخیلوس و پرۆتاگۆراس و سوکرات، کە سوور بوو شانۆگەرییەکانی یوریپیدیس بینێ. هەرچەندە لە (١٨) سالییەوە دەستی بە نووسینی شانۆگەری کرد بەلام تا تەمەنی (٣٠) سالی دەرفەتی بەشداربوونی پێشبرکێی بۆ نەرەخسا. نزیکەی (٩٢) شانۆگەری نووسیوە. یەکەم جار، سالی ٤٥٥ پ.ز خەلاتی سێیەمی وەرگرت، (٥) جار خەلاتی یەکەمی وەرگرتووە دەوری سالی ٤٠٦ پ.ز کۆچی دوایی کردو لە (ئەریتوزا) نێژرا.

تەنیا چەند شانۆگەری ماوە، وەکوو:

١- ئەلسێستیس

٢- میدیا

٣- هیپۆلۆتس

٤- ئەندروماکی

٥- مندالەکانی هەرقەل

٦- تەرواديیەكان

٧- ئيفجينيا لەتۆريس

٨-ئۆريستيس

٩-هێلين

١٠-ئەليكترا

(١٠) لەوانەيە ئەمە ئاماژە بێ بۆ شانۆگەری (ئۆرستيس)ی نووسينی (ئەليكسيس)ی شاعيری كۆميدی يۆنانی.

ئۆريستيس كوڕی ئەگامەمنوونە لە (كلێمنسترا). لەتۆڵەی كوژرانی باوكی، دايكی خۆی كوشتووە. لەم ئەفسانەيەدا بايەخ بەسێ لا دراوە: چۆنيەتی گەڕانەوەی ئۆريستوس لە تاراوگە/ ئۆريستوس و خوشكی/ ئەنجامی تاوانەكە. لەشانۆگەری (كۆيفۆرۆی) نووسينی ئەسخيلوس، ئۆريستوس بەفەرمانی ئەپۆلۆ دەگەڕێتەوەو بەناموٚيی دەچێتە ناو كۆشكی شاهانە، بەگوێی خۆی خەبەری مردنی خۆی دەبيسێ. دايكی خۆی دەكوژێ و خواكانی تۆڵە سەندنەوە لێرەو لەوێ راوی دەنێن.

# پەراوێزەکانی بەشی چواردەم

(١) واتە ئەو شتە دەرەکیانەی دەرهێنەر بەکاریان دەهێنێ وەکو: دیکۆر، بەرگ، رووبەند، ئیلقا، جوولانەوە...

(٢) کاریگەرو سەرچاوەی کاریگەر دووشتی زۆر گرنگن لە تراجیدیدا. ئەرەستۆ لێرەدا دەڵێ کاریگەرەکە دەبێ تەنیا لەردوتی رووداوە تێکچرژاوەکاندا بێتەدی، نەك لەئەنجامی هۆکاری دەرەکی بێ.

(٣) کلیتمنسترا: کچی تنداریوسی پاشای ئەسپرتەو خوشکی هیلانەی (دیۆسکوری) بوو. هێلانە ئەوە بوو پاریس هەڵیگرت و شەڕی تەروادەی لێ کەوتەوە. ژنی ئەگامەمنوون بوو و ئۆریسیتوس ئەلیکتراو کریسۆی تیمس لی لێ بوو. کاتێ مێردەکەی بوو بەسوپا سالارو چووە شەڕی تەروادە ئیگستوس کردی بەدۆستی خۆی. کە ئەگامەمنوون لەشەڕ هاتەوە. ئەو ژنە بەخۆی و بەدۆستەوە ئەگامەمنوونی کوشت. کە ئۆریستوس گەورە بوو، داوایان لێ کرد تۆڵەی باوکی بکاتەوە، ئەویش لە تۆڵەی باوکی کلیتمنسترای دایکی کوشت.نووسەرانی یۆنان زۆرجار ئەمەیان کردووە بەکەرەستەی بەرهەمەکانیان، زیاتریش پێیان لەسەر پێشاندانی لایەنی خیانەتکاری ژنەکە داگرتووە کە چۆن خیانەتی لە مێردەکەی کردو بەخۆو دۆستەکەیەوە لەناویان برد. زۆر هۆکاری جۆراوجۆر باس کراوە کە بۆچی کلیتمنسترا خیانەتی لەگەڵ مێردەکەی کردووەو بۆچی کوژراوە. هەر ئەویش بوو (کاساندرا)ی کچی پاشای

تەرادەی کوشت کە ئەگامەمنوونی مێردی بەدیل لەگەڵ خۆی هێنا بووی.

(٤) ئاریفیل Ariphyle ژنی ئەمفیارۆس بوو کە یەکێ بوو لەو حەوتەکەی دژی تیبە وەستان. ئەلکمایونی کوڕی بەقسەی باوکی ئەو دایکەی خۆی کوشت.

(٥) میدیا: هەریەکە لە ئەسخیلوس و سۆفۆکلیس و یۆریپیدیس درامایان بەو ناوە هەبووە بەڵام تەنیا ئەوەی یۆریپیدیس ماوە.

لەئەفسانەی یۆنانیدا، میدیا (واتە: فێڵباز) جادووگەرێکی بەدکارو بەناوبانگ بوو، کچی (ئیتیس)ی پاشای (کولخیس) بوو. دایکی ناوی (ئیدیا) بوو واتە (زانا). کاتێ (یاسۆن) کە بەدوای فەروەی زێریندا دەگەڕا گەیشتە کولخیس، میدیا ئەشقی بوو، بەڵام (ئیتیس) پاشای باوکی میدیا ویستی تەفرەی بدات و ئەوەبوو بەدوای زنجیرەیەك کردەوەی کوشندەدا ڕەوانەی کرد بۆ ئەوەی لەناوی بەرێ، بەڵام میدیا لەبەرئەوەی یاسۆنی خۆش دەویست بەهێزی سیحری خۆیەوە یارمەتی دا بۆئەوەی سەرکەوتووانە کارەکان ئەنجام بدات. دوای ئەوەی میدیا یارمەتی یاسۆنی دا بۆئەوەی فەروەی زێرینی دەست بکەوێ ڕەدووی کەوت و بەڕێگای دەریادا بەرەو وڵاتی یۆنان کەوتنە ڕێ. کە ئەوان هەڵاتن لەماڵەوە ڕاویان نان. هەندێ دەڵێن ئەپسیرتوسی برای میدیا سەرکردەی لەشکرەکە بوو، میدیا کوشتی، هەندێکی تر دەڵێن ئەپسیرتوسی برای بچووك بوو کەئەو ڕەدوو کەوت لەگەڵ خۆی بردی و کەزانی (ئیتیس)ی باوکی بەدوایانەوەیە، ئەو برایەی پەل پەل کردو فڕێی دایە سەر ڕێگای باوکی بۆئەوەی چیتر بەدوایاندا نەچێ. کە گەیشتنە (ئۆیکلوس)، (ئایۆن)ی پیرە بابی یاسۆنی گەنج کردەوە بەوەی لەناو مەنجەڵێکی پڕ گیای سیحری

کوڵاندیو کچەکانی (پلیاس)یشی تەفرەدا ئاوها لە باوکیان بکەن، هەندێ گیای بێ سوودی پێدانو پێی گوتن باوکیان لەناو ئەم گیایە بکوڵێنن گەنج دەبێتەوە، بەڵام گیاکە سیحری نەبوو، ئیدی باوکیان نەك هەر گەنج نەبووەوە، بەڵکو بەو کوڵاندنە هەڵا هەڵا بوو ومرد.

هەندێ دەڵێن کە گەیشتنەوە (ئۆیکلوس)، یاسون یەکسەر میدیای نەهێنا، بەڵکو بوونە میوانی (ئەلکینوس) پاشا، پاشای(فیاکیا) ئەلکینوس بەقسەی (ئەرتیا)ی ژنی خۆیا بڕیاری دا میدیا بداتەوە دەست قاسیدەکانی باوکی میدیا بۆئەوەی ئەگەر کچێنی خۆی دۆڕاندبێ بیکوژن. هەر (ئەرتیا)ش بڕیارەکەی بۆ (میدیا) ئاشکرا کرد، بۆیە هەرلەوێو لەئەشکەوتی (ماکریس) یاسۆن زەماوەندی لەگەڵ میدیا کرد. بەڵام یاسۆن پاشان وازی لەمیدیا هێناو چوو زەماوەندی لەگەڵ (کروسا)ی کچی (کریۆن)ی پاشای (کۆرنتێ)کرد. میدیا لە ڕقان تارایی چاوی داهاتو یەکەم جار بووکەکەو باوکی بووکەکەی بەژەهر لەناوبرد. ئینجا هەردوو کوڕەکەی خۆی کەلە یاسۆن بوو بووی لەبەردەم باوکیانا کوشتو کە یاسۆن ویستی تۆڵەی ئەو دڕندایتییەی لێ بکاتەوە، بەسواری گالیسکەیەك فڕییە ئاسمان کە دوو تنینی باڵدار ڕایاندەکێشاو هەندێ دەڵێن دوای ئەوە گەڕایەوە ئاتینو لەوێ مێردی بە (ئیگیسیوس) پاشا کرد.

(٦) ئەستیداماس : هاوچەرخی ئەرەستۆ بووە، دەڵێن ٢٤٠ تراجیدی نووسیوە. لە (١٥) پێشبڕکێدا، خەڵاتی وەرگرتووە.

(٧) تێلێگۆنۆس کوڕی ئۆدوسوس بوو. چووە ئیتاکا بۆئەوەی باوکی خۆی بدۆزێتەوە. بەڵام بێ ئەوەی باوکی خۆی بناسێتەوە لەشەڕێکا

برینداری کرد. لێرەدا لەوانەیە ئەرەستۆ ئاماژە بۆ شانۆگەرییەکی سۆفۆکلیس بکا لەم بارەیەوە بەم ناوەرۆکە نووسیویەتی.

(٨) ئەنتیگۆنە: یەکێ بوو لە چوار منداڵەکانی ئۆدیب، کە دوو کوڕ: ئینۆکلیس و پۆلینیکس و دوو کچ ئەنتیگۆنەو ئیسمینە بوون. هەندێ دەڵێن ئۆدیب ئەم چوار منداڵەی لە (جوکاستا)ی دایکی خۆی بووەو هەندێکی تر دەڵێن ئۆدیب دوای جوکاستا ژنێکی تری هێناوەو ئەم چوار منداڵەی لێ بووە. باسی ئەنتیگۆنە لە زۆر تراجیدیو سەرچاوەدا هاتووە. یەکێ لە سێینەکەی سۆفۆکلیس بەناوی ئەنتیگۆنەیە، یۆریپیدیسیش شانۆگەرییەکی بەناوی ئەنتیگۆنە هەیە.

لەشانۆگەری ئەنتیگۆنەی سۆفۆکلیس دا، هاتووە کە (کریۆن) پاشا بڕیار دەدا جەنازەی (پۆلینیکس)ی کوڕی ئۆدیب نەنێژن، چونکە پلانی لەدژی تیبە گێڕابوو، بەڵام ئەنتیگۆنەی خوشکی دژی بڕیارەکەی پاشا وەستاو جەنازەی برای خۆی ناشت. (کریۆن) پاشا پێی داگرت سزای ئەنتیگۆنە بدرێ، چونکە سەرپێچی لەبڕیارو فەرمانی پاشا کردبوو؛ ئەوسا (هایمون)ی کوڕی کە دەزگیرانی ئەنتیگۆنە بوو لەرووی باوکی وەستا. ئەنتیگۆنە لەداخا خۆی کوشت و (هایمۆن) بەدەم لاواندنەوە لاشەکەی گرتە باوەش، لەو حانەدا باوکی بەرەو ڕووی هات ئەویش گەیشتبووە تینی و زەبرێکی حەواڵەی باوکی کرد بۆ ئەوەی بیکوژێ بەلام باوکی زەبرەکەی بەرنەکەوت، ئیتر هایمۆن خۆی کوشت بۆ ئەوەی باوکی بەدەردی پەشیمانی بتلێتەوە.

(٩) کریسفۆنتس: یۆریپیدیس شانۆگەرییەکی بەم ناوە هەبووە بەلام نەماوە. کریسفۆنتس پاشای مسینا بوو. فۆلۆفۆتیس کوشتی. دوو کوڕیشی کوژران. (میروفا)، (ئایپوتوس)ی کوڕی سێیەمی ڕزگار

کردو ناچار بوو خۆیشی مێرد بە فۆلۆفۆنتیس بکا. کە ئایپوتوس گەورە بوو. فۆلۆفۆنتیسی کوشت و وڵاتی وەرگرتەوە.

(١٠) شانۆگەرییەکی بەناوبانگی یۆرپیپیدیسە.

(١١) هیللێ: ناوی شانۆگەرییەکە ئێستا نەماوە.

هیللێ کچی (ئاتاماس)ی پاشای (ئۆرکۆمێنە) بوو، باوەژنی ویستی بیکوژێ بۆیە ڕای کردو هەڵات. لە (هێلێسپۆنت) لەدەریادا خنکا. سەرگوزەشتەی ژیانی بۆتە بابەتی چەندین شانۆگەری.

# پەراوێزەکانی بەشی پازدەم

(١) سـكيللا: شـانۆگەرييەكی يۆنانييـە. پاڵەوانەكـەی كـچێكەو چيرۆكەكەی بەم جۆرەيە:

گلاوكـوس ماسـيگربوو، خواكـانی دەريـا لەڕەگـەزی مردەنـی شووشتيانەوەو كرديـان بـە خوايـەكی دەريـايی جاويـدان، بـەڵام لای سـەرەوەی بنيـادەمو لای خـوارەوەی ماسـی بـوو. خـۆی پێـشانی (سكيللا)ی خوای دەريادا. كاتێ كە لە لێوارێكی تەنكدا مەلەی دەكرد، (سـكيللا) لەبـەری هـەڵاتو چـووە سـەر لوتكەيـەكی بـەرزو بەسەرسـامييەوە سـەيری ئـەم نيـوە مرۆڤو نيـوە ماسـييەی كـرد. گلاوكوس بانگی كرد: "خانم، من جانەوەر نيم، خواو دەسەڵاتداری ئـاوم، مـن تـۆم خـۆش دەوێ." بـەڵام (سـكيللا) رووی لـێ وەرگێـڕاو رايكردو لەچاو بزر بوو. گلاوكوس بڕياری دا بچێتە لای (سيرسێ)ی ژنە جادووگەر بۆ ئەوەی دڵی (سكيللا)ی بۆ نەرم بكا، بەڵام كە چيرۆكی خـۆی بـۆ سيرسـێ گێڕايـەوە، سيرسـێ ئەشـقی بـوو وبەنازو عيشوەو قسەی خۆش دواندی بۆئەوەی دڵی بۆخۆی ڕابكێشێ بەڵام گلاوكوس دڵی بۆ نەبزووتو گوتی دونياش خراپ بێ من واز لە سكيللا ناهێنم. لێرەدا سيرسێ غيرەو ئێرەيی بەرامبەر (سكيللا) جۆشاو بڕياری دا كـەتنێكی پـێ بكـا. ئـەوەبوو ژەهرێكـی پيـسی گرتـەوەو چـووە ئـەو شوێنەی (سكيللا) مەلەی تيا دەكردو ژەهرەكەی لەئاوەكە كرد. كاتێ كە (سكيللا) هاتو بۆ مەلەوانی چووە ناو ئاوەكە، يەكسەر گۆڕاو بوو بە جانەوەرێكی ترسناك، سەری مارو سەگی لە لەش روا. دوازدە پێ و

شەش سەر. هەر لەوێ وەکو بەرد لەشوێنی خۆی چەقی و هەرکەشتیەك لێی نزیك بکەوتایەوە پەلاماری دەدا. پەلاماری کەشتی یاسۆن و ئۆدیسوس و ئەنیاسی دا. بەیەك جار شەش مرۆڤی دەقەپاندو لرفی دەکردن.

سکیللا زۆر چیرۆك و ئەفسانەی لەبارەوە هەیە.

(٢) میناليپێ. گوتاری میناليپێ لە شانۆگەرییەکی یۆریپیدیسدا هاتووە کە بەناوی (میناليپێی ژیر) نووسیویەتی.

میناليپێ کچێکی جوانی (ئیلۆس) پاشاو (هبی) شاژن بوو، کەباوکی بەسەفەر چوو ، سکی لە (بوزایدون)ی خوای دەریابوو. دوو کوڕی جمکی لێ بوو. فەرمانی بەکارەکەرەکەی دا بیانبا لەناو گەوڕی ڕەشەوڵاغان بیانشارێتەوە. مانگایەك شیری پێ دەدان و گایەك دەیپاراستن. گاوانێك منداڵەکانی دۆزییەوەو کەپاشا گەڕایەوە منداڵەکانی پێشکەش کرد. ئەویش بەو بیانووەی کە ئەمانە جانەوەرن و لە مانگان بوونە، بڕیاری دا بە زیندوویی بیانسوتێنن.

لێرەدا ئەرەستۆ ئاماژە بۆ ئەو دیمەنەی شانۆگەرییەکە دەکات کە میناليپێ بەشێوازێکی زۆر ڕەوان و پاراوو جەرگبڕ بەرگری لە دوو کوڕەکەی دەکا. لە کۆتاییدا ناچار دەبێ دانی پێدابنێ کە ئەمانە کوڕی ئەون. ئەوەبوو هەردوو چاویان دەرهێناو فڕێیان دایە کونجی بەندیخانەو دوو کوڕەکەشیان فڕێ دایە چۆڵەوانی بۆئەوەی ببن بەخۆراکی دڕندان وەکوو لە شانۆگەرییەکەدا هاتووە.

ئەرەستۆ ئەم گوتارە بە نموونە دێنێتەوە کە کارێکی ڕەوانبێژیی و فەلسەفی بووەو شتی وا لەبەهرەی ژنان ناوەشێتەوە. ئەفلاتوون لە (میوانداری) گاڵتەی پێ کردووە. ئەرەستۆش لای وایە لاواندنەوە

شایەنی پاڵەوانێکی جەنگی وەکوو ئۆلیس نییە، هەروەکو گوتاری ژیرانەو دارشتنی رێك و رەوان کاری ژنێکی وەکوو میناڵیپێ نییە.

(٣) شانۆگەری (میدیا)ی یۆریپیدیس ئاماژەیە بۆ گالیسکەی باڵدار، یان ئەو گالیسکەی تنینی باڵدار رایدەکێشن، کە میدیا سواری بوو و پێی هەڵات.

(٤) دیارە مەبەست لەو کتێبانەن کە ئەرەستۆ لەسەردەمی لاویدا نووسیوینی.

# پەراوێزەکانی بەشی شازدەم

(١) مەبەست خەڵکی تیبەیە لە ئەسپرتە کە بەکوێرەی ئەفسانە ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر ددانی ئەو ئەژدیهایە کە (کادموس) لەزەوی ناشتبووی. (کادموس) کە لەدۆزینەوەی خوشکی بێ نوێند بوو، نەیویست بگەڕێتەوە شاری خۆیان، بەقسەی غەیبگۆی دەلفی چووە شوێنێ، ئەژیهایەك لەوێ هەبوو کوشتیو ددانەکانی لەزەوی ناشتو لەجێی ئەو ددانانە مرۆۆ لەخاك هاتنە دەرەوەو شارێکیان هەر لەوێ دروست کردو ناویان نا (تیبە).

(٢) کارکینوس. دوو کەس بەو ناوە هەن، هەردووکیان تراجیدینووس بوون. لەوانەیە (ئەستێرە) ئەو نیشانە درەوشاوانەبن کە لەسەر شانی نەوەکانی (پیلۆپس)ەوە بوونو بۆی هەیە کارکینوس ناوی (ئەستێرە)ی لێ نابن. دەوری (١٦٠) شانۆگەری نووسیوەو بە (١١)یان خەڵاتی وەرگرتووە.

(٣) تێرو: ئامارەیە بۆ شانۆگەری (تێرو)ی سۆفۆکلیس. لەوێ دایکەکە دوو جمکەکەی بەهۆی ئەو بێشکەوە دەناسێتەوە کە تیا خرابوونە ڕوو، بێشکەکە لەشێوەی قەفەزدا بوو.

ئەفسانەکە دەڵێ: تێرو ئازداری کچی (ئەلیس) پاشا بوو. دوو کوڕی جمکی لە (بۆزیدۆن)ی خوای دەریا بوو. ناچار بوو لەکۆڵ خۆیان بکاتەوە. لەناو بەلەمێکی نانو بەئاوی وەنان. دوای چەند ساڵ، تێرو تووشی ئەشکەنجەو ئازاری (سیدور)ی زڕ دایکی بوو. ئاخری دوو

منداڵەکەی خۆی بەسەر گرتەوە کە هەراش بوون. ئەویش بەهۆی ئەو بەلەمەی بەشیرە خۆرەیی لەناوی نابوون. ئەو دوو کورە، توانیان تۆڵەی باوکیان لە زڕ دایکی دڵڕەقیان بکەنەوە.

(٤) (ئۆدیسوس)، ئۆلیس خۆی گۆڕیو هاتەوە ماڵێ، وایان زانی میوانێکی تازەیە. بردیان قاچی بشۆن، (ئۆرگلیا)ی پەرستیاری لەسەرشۆرشك جێ برینی گەزەی کەڵبەی بەرازی لەقاچی بینیو یەکسەر ناسییەوە، بەڵام بەش بەحاڵی (یومیوس)ی بەرازەوانو (فیلاتیوس)ی گاوان، ئۆلیس خۆی جێ برینەکەی پیشاندان بۆئەوەی بیناسنەوە. ئەرەستۆ ناسینەوەی پەرستارەکەی بەلاوە گرنگترە لەناسینەوەی بەرازەوانەکەو گاوانەکە، ناسینەوەی دووەکەی دواوە بەدوور لە هونەر دەزانێ.

(٥) تێریوس: پاشای (تراکیا) بوو. زەماوەندی لەگەڵ (پرۆکنێ)ی خوشکی پاشای ئاتین کردو کە هات بیبا پرۆکنێ داوای کرد، بۆئەوەی سەبووری دڵی بێ، فیلومیلای خوشکی لەگەڵ بنێرن. لەڕێگادا تێریوس دڵی دەکەوتە سەر فیلومیلایو لەگەڵی جووت بووو بۆئەوەی ئەو تاوانەی بشارێتەوە زمانی فیلومیلای بڕێ بۆئەوەی قسەی پێ نەکرێو لەشوێنێکی دوور شاردییەوە، بەڵام فیلومیلای چی بەسەر هاتبوو لەسەر پارچە قووماشێك بەنووسین چنیو بۆ (پرۆکنێ)ی خوشکی نارد. ئەویش چوو فیلومیلای خوشکی دۆزییەوەو بۆئەوەی تۆڵە لەو مێردە ناپاکەی بکاتەوە کوڕێکی هەبوو سەری بڕیو گۆشتەکەی برژاندو دەرخواردی مێردەکەی دەکا، کە مێردەکەی بەمەی زانی، ویستی هەردوو خوشکەکە بکوژێ، بەڵام گۆڕاو بوو بە پەپوو سلێمانەو فیلومیلای بوو بە چۆلەکەو پرۆکنێ بوو بە شالوور.

(٦) دیکـایگونیس شـاعیرێکی تراجیـدی سـەدەی (٤)ی پ.ز بـوو یـەکێ لـە شـانۆگەرییەکانی نـاوی (قوبرسـییەکان) بـووە. بابەتەکـەی بریتـی بـووە لـە گەڕانـەوەی (تـۆیکر) بـۆ (سـەلامین) دوای مردنـی (تێلامۆن). (تۆیکر) پێشتر باوکی نەفی کردبوو، کە بەدزی گەڕایەوەو چاوی بەتابلۆی رەسمی باوکی کەوت، گریا، بەمەوە کەسێتی خۆی ئاشکرا کرد.

(٧) پۆلیدوس: هەندێ رەخنەگر دەڵێن سوفستاییو هەندێکی تر دەڵێن نووسەری تراجیدی بووە. ژیانو بەرهەمی دیار نییە.

(٨) تیـدیوس شـانۆگەرییەك بـووە ئێـستا نـەماوە. لـە ئەفسانەدا هاتووە کە:

تیـدیوس کابرایـەکی وردیلـە بـوو، بەڵام زۆر زرنـگو ئازا بـوو. ئەو حەفتەی دژی تیبە بوون بەئەرکێك رەوانەی شاری تیبەیان کرد. لـەوێ چووە پێشبڕکێی وەرزشو بەسـەر هـەموو ناحەزەکانیـدا زاڵ بـوو کـە دەیان ویست بیکوژن.

(٩) تیـۆدێکتیس: گوتاربێـژو شـاعیرێکی یۆنـانی بـوو. دەوری ٣٧٥ی پ.ز لـە (سـالیس)ی سـەر بـە (لوکیـا) هاتۆتـە دونیـاوەو سالی ٣٣٤ی پ.ز کۆچی دوایی کردووەو لەسەر رێگای گوندی (ئەلیوسیس) نێژراوە.

تیۆدێکتیس ماوەیەکی زۆری ژیانی بە ئاینپەروەری بردۆتە سەر. لای ئەفلاتوونو ئیسۆکراتسو ئەرەستۆ خوێندوویەتی. گوتاربێژێکی ناودار بووە، تەنانـەت شیـشرون بـە شـێوازی گوتارەکـانی هەڵـدەڵێ. دەوری (٥٠) شانۆگەری نووسیوە، لە (١٣) پێشبڕکێ بەشداربووەو لە (٨) یـان خـەڵاتی وەرگرتـووە. لەگـەڵ ئەسـکەندەری گـەورە بەیەکـەوە

قوتابی ئەرەستۆ بوون، بۆیە پەیکەرێکیان بەچاودێریو سەرپەرشتی ئەسکەندەر، لەزێدی خۆیا بۆ قیت کردەوە.

(١٠) فینایـدا: شـانۆگەرییەکی کـۆن بـووە. ئێـستا هـیچ زانیـاری لەبارەوە نەماوە. بابەتەکەی ئەوەیە لە یۆنانی کۆندا، کە کچ لەدایك دەبوو دەیـانبرد لـەناو چیاو چۆڵ فرێیـان دەدا بۆئـەوەی لـەناو بچێ. هـەروەکوو لەدوورگـەی عەرەبیـشدا، پێش هـاتنی ئیـسلام، عەرەبـەکان جگە لەکچی یەکەمیان، هەر کچێکی تریان ببوایە زندەبەچاڵیان دەکرد.

(١١) ئەمە شانۆگەرییەکە هیچ زانیاری لەبارەوە لەبەردەستدا نییە. کە دەڵێ کەمانی ئۆلیس لە ئاشناو خزمەکانی خۆی زیاتر هیچ کەسێ لـەو ولاتـەدا ناتوانـێ رایبکێـشێ، بێگومـان بـۆی هەیـە کەسـێکی نەناسیاو، لەشوێنێکی تری ئەم دونیایە بتوانێ کەمانەکەی ئۆلیس رابکێشێ.

(١٢) ڕەنگە ئامارژە بێ بۆ شانۆگەری (ئیفجینیا)ی سۆفۆکلیس کە نـەماوە. بۆیـشی هەیـە ئامـاژە بـێ بـۆ (ئیفجینیـا لـە تـۆریس)ی یۆریپیدیس، کەماوە.

# پەراوێزەکانی بەشی حەڤدەم

(١) ئەمفیاروس: وشەکە (کەمانای- زۆر پیرۆز-ە) ناوێکی ئەفسانییە بۆ یەکێ لەو حەفتەی پەلاماری تیبەیان دا. لەکاتی پەلامارەکەدا، ئەمفیاروس رای کرد، بەلام نەیتوانی دەرباز بێ، کەوتە ناو زەندوڵی جێ بروسکێکی (زیوس)و کۆچی دوایی کردو مەزارێکی پیرۆزیان لە دەورە بنیات نا.

(٢) لەم دیمەنەی باس دەکا تەماشاکەرەکان تووڕەبوون، چونکە پاڵەوانە خواییەکە لەناو زەوییەوە دێتە دەرێ (پەیکەری ئەمفیاروس لە ئەشکەوتێکی ژێر زەوی‌دا بوو)، کەچی رەوشت وابوو خوا لەئاسمانەوە بێتە خوارێ.

(٣) ئەرەستۆ لای وایە نهێنی رەوانی شیعر لەوەدایە شاعیرەکە ڕاستگۆ بێ، ئەمە رای هۆراسیشە.

(٤)خواکە (ئەرتەمیس)ە، کە رۆمانەکان پێی دەڵێن (دیانا)، خودای مانگ و راو. لەدایکبوونە..

(٥) مەبەستی ئۆریستیس لەو چوونەی بۆ ئاتین، لەشانۆگەری تراجیدی (ئیفجینیا لە تۆریس)دا، بۆئەوە بوو لەسەر داخوازی (ئەپۆلۆ)، پەیکەری (ئەرتەمیس) لەوێوە بێنێ.

(٦)ڕووداوی شێت بوونەکەی‌و ڕووداوی رزگاری بوونی، هەردووکیان پەیوەندیان بەکردەوەی سەرەکییەوە هەیە، چونکە شێتاتییەکەی بۆئەوە بوو هۆی دەسگیرکرانی پێشان بدرێ‌و رزگار بوونیشی پەیوەندی بە خوشکییەوە هەیە کە کاهینەکەیە. پاکبوونەوەش لێرەدا بەوە دێتە دی کە قوربانییەك سەرببڕێ.

# پەراوێزەکانی بەشی هەژدەم

(١) (گرێ) بریتییە لە زنجیرە دیمەنێکی یەك لەدوای یەك، کە بەیەکەوە بەسراون و دەبن بەهۆی گرژیی درامی، (کردنەوە)ش بریتییە لەبەشی کۆتایی ئەو زنجیرەیە کە گرژییەکە دەڕەوێنێتەوە، واتە پاکبوونەکەوە دێتە دی.

(گرێ) هەندێ جار پێش شانۆگەرییەکەو هەندێ جار لەسەرەتای شانۆگەرییەکەوە دێ. ئەو گرێیەی پێش شانۆگەرییەکە دێ و ناکەوێتە ناو شانۆگەرییەکەوە، تەنیا گریمانەیەو بەس.

(گرێ) لە تراجیدیدا ئەوەیە کە رووداوەکان بەناویەکدا دەچن و بارودۆخ و چارەنووسی ئایندەی کەسەکان ئاڵۆز دەبێ و لێك شەتەك دەدرێ و دەبێ بەگرێ، پاشان کە رووداوە ئاڵۆزەکان وردە وردە رۆشن دەبنەوەو بارودۆخ و چارەنووسی کەسەکان ئاشکرا دەبێ، (کردنەوە) دەست پێ دەکا.

(٢) تراجیدییەکە ئاڵۆزە، پشت بە (ناسین)و (وەچەرخان) دەبەستێ.

(٣) تراجیدی ئازار. لێکدانەوەی زۆرجیاجیا بۆ وەرگێڕانی ئەم زاراوەیە کراوە، وەکوو: (چارەنووسساز/ داخبەر/ سۆزبزوێن.).

(٤) ئەجاکس یان ئەیاس ناوی شانۆگەرییەکی سۆفۆکلیسە، مێژووی نووسینی دیار نییە.ئەجاکس (بەلاتینی)، یان ئەیاس (بەیۆنانی)، یەکێ بوو لە پاڵەوانە یۆنانییەکانی شەڕی تەروادە، لەدوای (ئەخیل) گەورەترین پاڵەوانی ئەو شەڕە بوو. لەسەر زرێی

(ئەخیل) لەگەڵ (ئۆدیسوس) لێیان بوو بەناخۆشی، زرێیەکەیان بە (ئۆدیسوس)دا، چونکە سەرکردەکان لەژێر کاریگەری ئەگامەمنوون و منیلاوسی برای، خۆیان دایە پاڵ (ئۆدیسوس). لەبەر ئەمە جاکس لەداخان شێت و هار بوو و لەکۆتاییدا خۆی کوشت.

(٥) ئیکسیۆن: هەرسێ تراجیدینووسە گەورەکانی یۆنان. ئەسخیلوس و سۆفۆکلیس و یوریپیدیس شانۆگەرییان بەم ناوە هەیە. لەئەفسانەی یۆنانی کۆن، (ئیکسیۆن) پاشای (تسانیا) بوو. ئەسخیلوس بەیەکەم پیاو کوژی دادەنێ، واتە وەکو قابیل یەکەم کەس بووە یەکێکی لە رەگەزی خۆی کوشتووە. (دیانا)ی کچی (دایونیوس)ی هێنا. کە یەکێ لەخزمەکانی هات، ئیکسیۆن بەفێڵ کوشتی، قۆرتێکی پڕ ئاگری ئامادە کردو سەری داپۆشی. میوانەکەی کەوتە ناوی و مرد. لەسزای ئەم تاوانە کەوتە دۆزەخ، بە چەرخێک بەستراوەتەوە هەمیشە هەر لە سووڕاندایە.

(٦) جیاوازی لەنێوان تراجیدی کەسێتی و تراجیدی رەوشتپەروەری هەیە.

(٧) فتیۆتیدیس: واتە ژنانی فتیێ. یەکێکە لە شانۆگەرییەکانی سۆفۆکلیس، تەنیا چەند دێڕێکی ماوە (فتیێ) شارێ بووە لە (ئیتالیا)؛ زێدی (ئەخیل) بووە.

(٨) پیلیوس. باوکی ئەخیل بوو. پاشای یەکێ لە شارەکانی (تسالیا) بوو. لەئەفسانەی یۆنانیدا دەڵێ تاکە ئادەمیزادێک بوو خوازنێکی هێناوە بەناوی (تیتس).

سۆفۆکلیس و یۆریپیدیس یەکەو شانۆگەرییان بەم ناوە هەیە.

(٩) فورسيديس (كچانی فورسيس). ناوی شانۆگەرییەكی بزرە. نووسەرەكەی دیار نییە. دیارە شانۆگەرییەكە پڕ دیمەنی سەیرو سەمەرە بووەو بۆ كاركردنە سەر دانیشتوان بەشێوەیەكی بنەڕەتی پشتی بە دیمەنەكان بەستووە.

(١٠) پرۆمیتوس نیوە خودا بوو. لە شانۆگەری (پرۆمیتوسی زنجیركراو)ی ئەسخیلوس دا، هاتووە كە ئاگری لە زیوس دزیوەو داویە بە ئادەمیزاد. لەسزای ئەم كارەیا، زیوس فەرمانیدا لە چیایەك زنجیریان كرد، هەڵۆیەك دەهات جەرگی دەخواردو دووبارە جەرگی دەڕوایەوە. لەكۆتاییدا (هەرقەل) رزگاری كرد.

(١١) هادیس. وشەكە مانای (ئەوەی نابینرێ)، یان (ئەوەی لەچاو بزرە) دەدات. یەكێ بوو لەكوڕەكانی (كرۆنۆس)و پاشای دونیای ژێرەوە بوو كە پێیان دەگوت مەڵبەندی هادیس. ئەوەی دەمرێ دەچێتە هادیس (دونیای ژێرەوە). هادیس هەر ئەوەندەی لەبارەوە زانراوە كە (پێرسفۆنە)ی هێناوە. وەكو پیاوێكی رووگرژو زۆر توند لەگەڵ گوناهكاران، وێنەی كێشراوە، بەڵام هەرگیز وەكو كەسێكی بەدكار وێنەی نەكێشراوە.

(١٢) نیۆبێ: ئەسخیلوس شانۆگەرییەكی بەوناوە هەیە. لەئەفسانەی یۆنانیدا، كچی (ئەنتالس)ی كوڕی (زیوس)ە لە (دیونی)ی خوشكی (پیلوپس). شووی بە (ئەمفیۆن) كرد، دایكی حەفت كوڕو حەفت كچ بوو (هەندێ دەڵێن دە كوڕو دە كچ، هەندێكی تر دەڵێن شەش كوڕو شەش كچ)، لافی منداڵ زۆری لەسەر دایكی ئەپۆلۆو ئەرتەمیس لێ دا، كە هەر تەنیا ئەو منداڵەی هەبوو، ئەو دوو منداڵە تیرە بارانیان كردو كوشتیان.

(١٣) سیزیفوس (سیزیف). یەکێ بوو، لەپاشاکانی (کۆرنتێ). بەپڕ ئالۆشی و پڕدانە ژنی خەڵک ناسرابوو. خواکان ئەو سزایەیان بۆ بڕییەوە کە بەردێکی زل لە بنی چیاوە هەڵبگرێ و بەسەر ترۆپکی چیاکەی بخا، بەڵام هەموو جارێ کە دەگاتە نزیک ترۆپکی چیاکە، بەردەکەی لەدەست گلۆر دەبێتەوە خوارێ و دەبێ دووبارە تێ هەڵچێتەوە. هەتا هەتایە بەم سزایە بێ هوودەیەوە بەندە.

(١٤) ئەم بۆچوونە بە دوو دێڕ لای (ئاگاتۆن) هاتووە. ئەرەستۆ لە (هونەری گوتار)یشدا هێناویەتی، بابەتەکەی ئەوەیە: شتی شیاو دەشێ لەگەڵ هەموو شتێکی شیاو ناکۆک بێ.

# پەراوێزەکانی بەشی نۆزدەم

(١) ریتۆریکا (هونەری گوتاردان)، ئەرەستۆ ئەوسا هێشتا ریتۆریکای نەنووسیبوو، دوای پۆیەتیکا، (هونەری شیعر-شیعرناسی)، ئینجا دەستی بەنووسینی ریتۆریکا کرد بەڵام بۆی هەیە لەکاتی نووسینی پۆیەتیکا پلانی ریتۆریکای دانابێ. ریتۆریکا دووەم کتێبی ئەرەستۆیە لەبارەی لێکۆڵۆڵینەوەی زمانو ئەدەب، سێ بەشە: بەشی یەکەم (١٥) تەوەرەیە. باسی سروشتی گوتاردان دەکاتو لایەنی لێکچوونو جیاوازی لەگەڵ ژیربێژی پێشان دەداتو ئینجا ئامانجو هۆی پەیدا بوونو جۆرەکانی سەرچاوەکانی دیاری دەکات. بەشی دووەم (٢٦) تەوەرەیە. باسی بنەماکانی ئیقناع کردن دەکا لەگەڵ بابەتەکانی هەر جۆرە گوتارێك. بەشی سێیەم (١٩) تەوەرەیە باسی رەگەزەکانی شێوە و ناوەرۆكو بەشەکانی ئاخاوتنو رێکخستنیان دەکات.

(٢) لایەنەکانی هونەری گوتاردان ئەمانە دەگرێتەوە: سەلماندنو پیادەکردن، بزواندنی ترسو بەزەیی، زل کردن یان بچووك کردنی شت.. ئەمانە دەبێ لە تراجیدیشدا هەبن. جیاوازی شاعیرو گوتاردەر لەوەدایە کە: شاعیر پشت بە چیرۆك (چنین) دەبەستێو بەڕاکێشانی دڵی جەماوەر مەبەستی دێنێتەدی، کەچی گوتاردەر مەبەستی یەکەمی پەروەردەو ئاراستە کردنە.

(٣) ئەم دێڕە سەرەتای (ئیلیادە)یە. یەکەم دێڕەو سلیمان البستانی بەم جۆرە کردوویەتی بەعەرەبی:

ربه الشعر عن اخيل ابن فيلا        انشدينا وارو احتداما وبيلا

(ص٢٠٢)

(٤) پرۆتاگۆراس: کەیەکێ بوو لە فەیلەسووفە سوفستاییەکان. دەوری ساڵی ٤٨٠ پ.ز لە (ئەبدیرا) لەدایك بووەو دەوری ٤١٠ پ.ز کۆچی دوایی کردووە. ناسیاوی لەگەڵ دیمۆکرۆسی فەیلەسوفی ناودار هەبوو. بەهەموو ئیتالیای باشوورو یۆناندا گەڕاو بچووبایە هەر شوێنێ گوتارە ڕەوان و پتەوەکانی سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشا. ساڵی ٤٥٠ پ.ز چووە ئاتین بەڵام زۆر نەمایەوە چونکە بەبێ بڕوایی تاوانباریان کردو هەموو کتێبەکانیان سووتاندو حوکمی مردنیان بەسەردادا، هەڵات و لەکاتی هەڵاتندا لەناو ئاودا خنکا.

یەکێ لەکتێبە بەناوبانگەکانی پرۆتاگۆراس ئەوەیە کە بەناوی (ڕاستی – الحقیقە) نووسیویەتی. لەسەرەتادا هەندێ وشەو دەستەواژەی تێدا بوو بۆنی بێ باوەڕیان بۆ خەڵکەکە تێدا بوو. ئەفلاتوون لەیەکێ لە گفتۆگۆکانیدا ناوی پرۆتاگۆراس دێنێ کە زیندووە، کەچی لە گفتۆگۆیەکی تردا دەڵێ دەمێکە مردووە.

پرۆتاگۆراس یەکەم کەس بووە لەبەشەکانی ئاخاوتنی کۆڵیوەتەوە، واتە چۆنیەتی گۆڕانی ڕستەو دەستەواژە بەپێی گۆڕانی بارودۆخی قسەکەرو گوێگر.

باسی بابەتی وەکو (هیڤی، پرسیار، فرمان،..)ی کردووە.

## پەراوێزەکانی بەشی بیستەم

(١) ئـەم بەشـەو بەشـی دادێ لـەبارەی سروشـتی زمـانی یۆنانییە، بۆیە چ لەئاستی دەنگسازی (فۆنۆلۆجی) بێ و چ لەئاستی وشەسازیدا بێ (مۆرفۆلۆجی)و تەنانەت لە خوازەو داڕشتنی رستەشدا تووشی هەندێ شت دەبین کە بۆ ئێمە مانان زۆر روون نییە. من هەوڵم داوە دەنگەکان بە تیپی ئێستای نووسینی کوردی بنووسمەوە. یان هەندێ وشەی کوردی لەبار بۆ جۆرەکانی وشەی یۆنانی بدۆزمەوە.. نەمویست وشەکان بە ئەلفبای گریکی بنووسمەوە، چونکە خوێنەری کورد، مەگەر تاك و تەرا، ئەگەرنا بەم ئەلفبایە ئاشنا نین.

ئەرەستۆ لەباسی دانە بچووکەکانی زمانی گریکی زۆرجار تیپ و دەنـگ لـەجێگای یـەکتر بـەکار دێنـێ. ئەرەسـتۆ لـە لێکۆڵینەوەکەیـدا بەشێوەیەکی ژێربیژی لە بچووکترین دانەی زمان دەست پـێ دەکا کە دەنگەو ئینجا برگەو وشەو رستەو ئاخاوتن..

(٢) ئـەم ئـامرازە پەیوەندییانـە لـەیۆنانی هەمیشە دەکەونـە دوای وشەوە.

(٣) بۆچوونی تایبەتی لەبارەی شوێنی ئامرازەکانەوە هەیە، بەڵام هەر گریمانەیە.

(٤) لێرەدا (ناو)، (ناوەڵناوو راناو)یش دەگرێتەوە.

(٥) وەکـوو ئـەوەی بڵـێین: (مـرۆڤ شیاوی زانـستە)، ئەمـە بـەلای ئەرەستۆ قسەیەکی بێ بکەرە. رستەیەکی وەکو (کلیۆن دەڕوا)ش وەکو (ضرب زيد عمر وا)ی عـەرەبی هەمیـشە بەسـەرزاری زاناکـانی زمـانی یۆنانییەوە بووە.

# پەراوێزەکانی بەشی بیستو یەکەم

(١) ئەم ناوە لەناوی سێ رووباری ئاسیای بچووك دروست بووە، کە خەڵکی (مارسیلیا) تا ئەوسا ئەم روبارانەیان بەلاوە زۆر پیرۆز بوو. (مارسیلیا) کۆلۆنیایەك بوو لە (فۆکیا). لەوە دەکا ئەم وشەیە نازناوی زیوس بووبێ نەك ناوی تایبەتی. سێ رووبارەکە ئەمانەن:
(هێرموس، کایکوس، کرانتوس.)

(٢) سیگونۆن واتە پرم.

(٣) هەندێ بە (خوازراوە)و هەندێ بە (نامۆ) لێکیان داوەتەوە. وشەکە لە یۆنانی بەرامبەر بە وشەی زمان (اللسان) دەوەستێو مەبەست لە وشەی زمان ئەو وشە بێگانەیە بووە کە پێویستی بە لێکدانەوە هەبووە، بۆیە دەگمەنو نامۆ بووە.

(٤) (وەستان) رەگەزە، (لەنگەرگرتن) جۆرێکە لە جۆرەکانی (وەستان).

(٥) وشەی (زۆر) رەگەزە، (هەزاران) جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەو رەگەزە.

(٦) دیۆنیسیوس لە ئەفسانەی یۆنانیدا کوڕی زیوس بووە لە (سمیل)ی کچی (کادموس)ی پاشای تیبە. خوای شەرابو رەزو بەروبوومو پیتو شادیو هێزی بەرهەم هێنان بووە.

(٧) ئاریس لە ئەفسانەی رۆمانیدا بە مارس ناسراوە، کوڕی زیوس بووە لە هیرا. خوای شەڕ بووە.

(٨) وشەی یۆنانی بەرامبەر (کاهن) دووجار لە ئیلیادەدا هاتووە.

(٩) ئـەم دابەشـكردنی نـاوە بـەپێی رەگـەز، بـۆ پرۆتـاگۆراس دەگەڕێتـەوە. (بڕوانـە : پـەراوێزی ژمـارە (٤)ی بەشـی نـۆزدەم) ئەرەستۆفان لە شانۆگەری (هەور)دا گاڵتە بەم دابەشکردنە دەکات.

# پەراوێزەکانی بەشی بیستو دووەم

(١) ستینیلوس: شاعیرێکی تراجیدیە لەسەدەی (٥)ی پ.ز ژیاوە. ئەرەستۆفان لە کۆمیدی (زەردەواڵە) پەلاماری داوە. ئەرەستۆ لای وایە ئەم نووسەرە وشەی باوو ئاسایی بەکارهێناوە بۆیە شێوازی شیعری نزم بووە.

(٢) ئەرەستۆ لە (هونەری گوتاردان)دا، جارێکی تر دێتەوە سەرباسی گیروگرفتی هەڵبژاردنی وشەی شیعری.

(٣) مەیلو مەتەڵێکی کۆنی یۆنانی بووە. مەتەڵەکە لە وشەکانەوە دروست بووە. بەتێگەیشتنی مانای (برۆنز) مەتەڵەکە شی دەبێتەوە. (برۆنز) لەم مەتەڵەیەدا مەبەست کەلەشاخی خوێن بەردانە کەلای ئەوان لە برۆنز دروست دەکرا.

(٤) ئەم شاعیرە هۆمیروسە.

(٥) ئیکلیدس. فەیلەسووفێکی یۆنانی بووە. ساڵی ٤٥٠ پ.ز لەدایك بووە. دامەزرێنەری قوتابخانەی میگارییە. یەکێ بوو لە قوتابییەکانی سوکراتو ئاسیاوەکانی ئەفلاتوون. دوای مردنی سوکرات، هەندێ لە یاوەرو قوتابییەکانی (بەرهەمی سوکراتانەیان) دەنووسیو بیروباوەڕی سوکراتیان بڵاودەکردەوە. هەرە بەناوبانگەکانیان سێ کەس بوون:

أ- ئیکلیدس - دامەزرێنەری قوتابخانەی میگاری.

ب- ئینتستانس - دامەزرێنەری قوتابخانەی سەگانی.

ج- ئیرستبوس - دامەزرێنەری قوتابخانەی کورینایی.

ئەمانە پێیان دەگوترا (سوکراتیی بچووک) یان (نیمچە سوکراتی)، بەوناوەی کە ئەفلاتوون سوکراتی گەورە بووە.

ئیکلیدس گەڕایەوە (میگاری) زێدی خۆیو قەتابخانەیەکی لێ دروست کرد کە بەپیلەکەو گفتۆگۆ بەناوبانگ بوو. ئیکلیدس یەکەم جار ڕێبازی (ئیلی) بەمشتو مڕەوە لەبارمنیدسو زینون وەرگرت، پاشان شارەزایی لەسەر سوفستاییەکان پەیدا کرد. ڕێبازەکەی لە (ئیلی)و (سوکراتی) تێکەڵ بوو و ئارەزوویەکی بەهێزی بۆ سەفسەتە هەبوو. یەکێ لەقسە باوەکانی ئەوەبوو کە: بوون یەکەو خێریش یەکە، ئەگەر خێر نەبێ، بوون نییە.

(٦) ئەم دوو دێڕە زۆر توندو تیژن. خەربەق ڕووەکێ بووە بۆ چارەسەری شێتی بەکار هاتووە.

(٧) فیلوکتیتس: لە ئەفسانەی یۆنانیدا، بەناوبانگترینو شارەزاترین تیر هاوێژ بوو. هەرقەل تیری ژەهراوی خۆی بەمیرات بۆ بەجێ هێشت. لە سەفەری چوونە تەروادەیا لە دوورگەیەك باروبنەی خست بۆئەوەی پشوو بدا، هەندێ دەڵێن لەوێ مارێك پێیەوە داو هەندێ دەڵێن یەکێ لە تیرە ژەهراوییەکانی خۆی بە پێی کەوت. برینەکەی لێ پیس کردو بۆنێکی وای تێ کەوت کەس خۆی لەبەر ڕانەدەگرت. هەموو خزمو کەسو کاری لێی تەکینەوەو لەو دورگەیە بەتەنیا جێیان هێشت. تا ساڵی دەیەمی شەڕی تەروادە لەوێ مایەوە. ئەوسا غەیبگۆ گوتیان تەروادە بەتیری هەرقەل نەبێ ناگیرێ، ئەوەبوو ئۆدسیوس بەناچاری لەدوای نارد. کاتێ فیلوکتیتس گەیشتە تەروادە، (ئەسکلبیوس)ی خوای پزیشكو چارەسەرکردن چاکی کردەوە.

هەریەکە لە ئەسخیلوس و سۆفۆکلیس تراجیدیان بەم ناوە (فیلوکتیتس) هەیە. ئەوەی سۆفۆکلیس ماوە، بەڵام ئەوەی ئەسخیلوس نەماوە.

(٨) ئەریفرادیس شتێکی وای لەباردوە نەماوە. هەندێ لایان وایە ئەمە ئەریفرادیسی کوڕی (ئۆتۆمینس)ە کە ئەرستۆفان گاڵتەی پێ کردووە.

(٩) دیارە لێرەدا باسی تراجیدی تەواو دەبێ و لێرە بەدواوە ئەرستۆ دەچێتە سەر شیعری داستانی.

# پەراوێزەکانی بەشی بیست و سێیەم

(١) داستان شێوازو چیرۆك و گێڕانەو چۆنیەتی ڕێکخستنی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لەرووی بابەتە لەتراجیدی دەکا کە هەردووکیان لاسای خەڵکە بەرزەکە دەکەنەوە.

(٢) داڕشتنی درامی دەبێ کردەوەیەکی تەواو پێگەیشتوو بنوێنێ، واتە چیرۆکەکە دەبێ سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی هەبێ. وەکو بوونەوەرێکی زیندوو، خۆی لە خۆیەوە تەواو بێ.

(٣) سەلامین: دوورگەیەك بوو لە نزیك کەناری رۆژهەڵاتی هەرێمی (ئەتاکیا). لەوێ، لەشەڕێکی دەریاییدا، ساڵی ٤٨٠ پ.ز سوپای یۆنانی سوپای فارسی تێك شکاند کە ئەرەستۆفان لە شانۆگەری (هەور)دا ئاماژەی بۆ دەکا. سەلامینی لە بنچینەدا کۆلۆنیایەکی سەر بە (ئایجینا) بوو. دەوری ساڵی ٦٠٠ میگارا داگیری کرد، بەڵام لەسەردەمی سۆلۆن و پیزیستراتۆس بە ئاتین لکێنرا. ساڵی ٣١٨ پ.ز مەکدونیەکان داگیریان کرد. ساڵی ٢٣٠ پ.ز ئاراتۆس لە ئاتینی سەندەوە.

(٤) قرتاجە شارێکی کۆنە دەکەوێتە سەرکەناری باکووری کیشوەری ئەفریقیا. دەوری (١٢) میل لەشاری تونسی ئێستا دوور بووە. ساڵی ٤٨٠ پ.ز سوپای قرتاجە لە پەلامارێکی دوورگەی سقلیەدا شکستی هێنا.

(٥) هیرۆدۆتس دەڵێ هەردوو شەڕەکە لەیەك رۆژ قەوماون.

(٦) (ئیلیادەی بچکۆلە) دەدەنە پاڵ شاعیری داستانی لیسکیس سەدەی (٧)ی پ.ز. بابەتی داستانەکە بریتییە لە پێشوازی کردنی ئەسپە دارینەکەی تەروادە.

(٧) قوبرسنامە، یان سرروودەکانی قوبرس، بۆ سەدەی (٨)ی پ.ز دەگەڕێتەوە. ئەمە ئەڵقەیەك بوو لە زنجیرە داستانێك کە هیرودۆس دەیداتە پاڵ هومیروس. هەندێ جاریش دەیدەنە پاڵ ئەستاسینوسی قوبرسی.

(٨) ئەمە باسی کێشەی نێوان ئۆدسیوس و ئەجاکس دەکا لەسەر زرێی ئەخیل. سۆفۆکلیس شانۆگەرییەکی لەسەر ئەم بابەتە نووسیوە بەناوی (ئەجاکس).

(٩) فیلوکتیتس: هەریەکە لە ئەسخیلوس و سۆفۆکلیس و یوریپیدیس شانۆگەرییان لەسەر ئەم بابەتە نووسیوە. فیلوکتیتس یەکێ بوو لە برادەرە هەرە دڵسۆزەکانی هەرقەل، پاڵەوانێکی تەروادە بوو.

(١٠) نیوپتۆلیموس کوڕی (ئەخیل)ی پاڵەوانە. دوای مردنی باوکی بەشداری شەڕی تەروادەی کرد. بریام پاشای کوشت و (ئەندروماك)ی بەدیل گرت و کردی بە مەحبووبەی خۆی. زەماوەندی لەگەڵ (هرمیۆن)ی دەزگیرانی ئۆریست کرد.

(١١) یوریپیلوس. دۆستی (کاسندرا)ی تەروادی بوو. نیۆپتۆلیموس کوشتی.

(١٢) ئۆدیسوسی دەرۆزەکەر لە ئۆدیسەدا هاتووە.

(١٣) لاكۆنیا هەرێمێکە دەکەوێتە باشووری یۆنان. ژنانی لاکۆنیا (یان ژنانی ئەسپرتە) ناونیشانی شانۆگەرییەکی ئەسخیلوسە، تەنیا (٥) دێڕی لیّ ماوە.

(١٤) تالانی تەروادە، یان رووخانی ئیلیوم. (ئیلیوم، ئیلیۆن، ئیلیۆس ناوی کۆنی تەروادە بوون). ئەرکێنوسی شاعیر باسی تالانی ئیلیۆسی کردووە.

(١٥) ناونیشانەکەی زۆر دروست نییە.

(١٦) سینۆن: سەرکردایەتی ئەسپە دارینەکەی تەروادەی کرد کە رێی خۆش کرد بۆ ئەوەی هاولاتییەکانی دەروازەی شار داگیر بکەن. تەروادییەکان گرتیان‌و لووت‌و گوێیان بڕی، بەلام دواتر کە یۆنانییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا شەرەف‌و شکۆمەندییان بۆ گێڕایەوە. سۆفۆکلیس تراجیدییەکی بەو ناوە هەیە. تەنیا (٣) وشەی ماوە.

(١٧) (ژنانی تەروادە) یەکێکە لە شانۆگەرییەکانی یۆریپیدیس.

# پەراوێزەکانی بەشی بیستو چوارەم

(١) دابەشکردنی تراجیدی بۆ ئەم چوار جۆرە جێگای گفتوگۆ بووە لەناو شروڤەکاران. دابەشکردنی داستانیش بۆ هەمان ئەم جۆرانە بۆتە جێگای گفتوگۆیەکی تر. ئەرەستۆ دیارە مەبەستی ئەوە نییە پۆلێن کردنی ورد ئەنجام بدا، بەڵکو دەیەوێ لایەنی پێکچوونی تراجیدیو داستان پێشکەش بکا.

(٢) رەگەزەکانی داستان ئەمانەن: چنین، کەسێتی، هزر، زمان.

(٣) ئەوەی تێدایە کە: ئەتلیماکوس، نەستورو منیلاوسو هیلانە ناسیانەوە، کەچی ئۆدیسوس، کۆکلوپسو ئەلفیاکسیونو یۆزوکلیا و بەرازەوانەکانو ئەتلیماکوسو فانلوفیا و باوکیشی ناسیانەوە.

(٤) ئاشکرایە شاعیری تراجیدی سێ تراجیدیو ساتیرییەکی بۆ پێشبڕکێ پێشکەش دەکرد. ئایا ئەرەستۆ داوا دەکا کە درێژی دراما بەقەدەر درێژی هەرسێ تراجیدی بێ، یان هەر چوار شانۆگەرییەکە بەسێیەکی درێژی ئیلیادە تەخمین دەکا؟ هەندێ لە تۆژەرەوان رایان وایە کە درێژی داستان دەبێ بەقەدەر درێژی ئەو هەموو شانۆگەرییانە بێ کە لەیەک رۆژدا پێشکەش دەکران. واتە بەقەدەر درێژی (١٢) شانۆگەری بێ. (٩) تراجیدیو سێ ساتیری.

(٥) لەکتێبی (هونەری شیعر)دا، تەنیا لێرە باسی (یەکێتی شوێن) کراوە کە یەکێکە لە سێ یەکێتییەکەی رەخنەگرانی سەردەمی راپەرین باسیان کردووە: یەکێتی کاتو یەکێتی شوێنو یەکێتی رووداو.

(٦) ئەمە لە كتێبی (هونەری گوتاردان)یشدا هاتووە. شیشرۆنیش ئاماژەی بەو ناوەرۆكە كردووە.

(٧) سەرسامی یان تاسان، رەگەزێكی گرنگی دراماییە، وا لە تەماشاكەران دەكا لەگەڵ دیمەنی شانۆییدا بەردەوام بن و لێی نەپچڕێن.

سەرسامی لە ڕوودانی شتێكی چاوەڕێ نەكراوەوە دێ. بۆیە پێچەوانەی ئیحتیماله.

(٨) هیكتۆر كوڕی بریامی پاشای تەروادەو مێردی ئەندروماك بوو. هیكتۆر پاڵەوان و سوپا سالاری تەروادە بوو. دەوری (٣١) پاڵەوانی یۆنانی كوشت، بەڵام ئاخیری خۆیشی بەدەستی ئەخیل كوژرا.

(٩) ئەخیل گەورەترین پاڵەوانی یۆنانی بوو لەشەڕی تەروادەدا.

(١٠) ڕووداوی (خۆشووشتن) سەراپای سروودی (١٩)ی ئۆدیسەی داگرتووە. شرووڤەكارانی هونەری شیعر دەڵێن ئەرەستۆ لێرەدا ئاماژە بۆ پێوەرێكی چەوت دەكات:

كاتێ ئۆلیس دەگەڕێتەوە (ئەتاكا)و جل و بەرگ و ئەدگاری خۆی دەگۆڕێ و بەبێ ئەوەی بیناسنەوە دەچێتە ناو كۆشكی خۆیان و دەڵێ ناوم (ئیتۆن)ەو خەڵكی (كریت)م، بۆئەوەی سەرنجی پێنێلۆپێ بۆخۆی رابكێشێ دەڵێ من ناوم (ئیتۆن)ەو كاتی خۆی كە ئۆلیس بەرەو تەروادە دەچوو، بەخۆو بە هاوەڵەكانی لایدایە كۆشكی من و میوانی من بوو. پێنێلۆپی بۆئەوەی تاقی بكاتەوە داخۆ راست دەكا یان نا، لێی دەپرسێ داخۆ ئەدگارو جل و بەرگی ئۆلیس و هاوەڵەكانی چۆن بوو؛ ئەویش بەوردی هەمووی بۆ باس دەكا، پێنێلۆپی پێی بڕوا دەكات. بەلای ئەرەستۆ پێنێلۆپێ لە پێوانەگەریدا بەهەڵەدا چووە، چونكە

لەوەسفی ئەدگارو جل و بەرگی ئۆلیس کەدواتر هاتووە، بڕوا بە پیشەکییەکە دەکا کە (کەسەکە ئیتۆنی کریتییە). ئەم پێودرە چەوتە.

( ۱۱)ئیلیکترا یەکێکە لە تراجیدییەکانی سۆفۆکلیس. ئەرەستۆ دەڵێ ئۆریستیس لەیاری (پیتی)دا مردووە، بەلام لەوکاتەدا یاری (پیتی) نەبووە.

(۱۲) یاری (پیتی). ئەم یارییانە لە دەلفی بەدەم ئاهەنگەوە دەکران. یەکەم جار هەر نۆ ساڵ جارێك یارییەکان دەکران، پاشان بوو بەچوار ساڵ. یارییەکان لەئاهەنگی بیرەوەری کێشەی ئەپۆلۆن و پیتۆن و دامەزرانی ئیلهامی دەلفی دەکران. یاریگاکە لەخاکی (کریسا)ی کۆن دروست کرابوو. (پندار)ی شاعر شیعری بەم یارییانە هەڵداوە.

(۱۳) میسییەکان: یەکێکە لە شانۆگەرییەکانی سۆفۆکلیس.

(۱٤) شاری (تیگیا ) دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی دەشتی (ئەرکادیا).

(۱۵) هەرێمی میسیا دەکەوێتە رۆژئاوای ئاسیای بچووک.

# پەراوێزەکانی بەشی بیستو پێنجەم

(١) ئەگەر شاعیر وابزانێ کاتێ کەئەسپ دەڕوا، دەستو پێی راستەی بەیەکەوە داوێ‌و وێنەیەکی وردی ئەم حاڵەتە بکێشێ هەڵەکەی رووکەشە، بەڵام ئەگەر شارەزاییەکی باشی لە بابەتەکە هەبێ‌و نەتوانێ وێنەیەکی باشی بکێشێ هەڵەکەی جەوهەرییەو هونەرەکەی دروست نییە.

(٢) زینەفۆنیس شاعیرو فەیلەسووفێکی یۆنانی کۆن بوو. لەشاری (کۆلۆفۆن) لەدایك بووە. دەوری ساڵی ٥٤٥ پ.ز کە ئەوساکە تەمەنی (١٥) ساڵ بوو ئەو شارەی بەجێ هێشت، دەڵێن رەنگە رۆیشتنەکەی بەهۆی پەلاماری فارسی بوو بێ بۆ سەر وڵاتی یۆنان. ماوەیەکی بەگەڕیدەیی بردەسەر، دواجار لە باشووری ئیتالیا گیرسایەوە. شیعری داشۆرینی نووسیوەو هۆنراوەیەکی فێرکاری دوورودرێژی هەیە بەناوی (لەبارەی سروشتەوە)، هەندێکی لێ ماوە. هەندێ بەرهەمیشی لەبارەی رەخنەوە هەیەو چەند بیردۆزەیەکی فیزیاوی داناوە. دەڵێن هێرشی کردۆتە سەر هۆمیروس‌و هزیۆد، چونکە رووداوی خراپیان داوەتە پاڵ خواکان. هەروەها دەڵێن دامەزرێنەری قوتابخانەی (ئیلیاتی) بووە لە فەلسەفەدا.

(٣) ئیلیریا: هەرێمێك بوو کەوتبووە رۆژئاوای یۆنان بەدرێژایی کەناری دەریای ئەدریاتیك درێژ دەبووەوە. (کادمۆس) پاشای تیبە رای کرد چووە ئەوێ‌و بوو بە پاشای ئیلیریا.

(٤) دۆلۆن: کابرایەکی تەروادەیی بوو. بەخۆشبەزی ناوبانگی دەرکردبوو. هیکتۆر ناردبووی سیخوڕی بەسەر یۆنانەکانەوە بکات.

(٥) هیپپیاس. خەڵکی (تاسۆس) بوو. یەکێ بوو لە بیرمەندەکانی سەدەی (٥)ی پ.ز.

(٦) گانیمیدی، یان گانیمیدیس. کوڕێکی تەروادەیی جوانکیلە بوو. هەڵۆی زیوس فڕاندیو بردییە سەر چیای ئۆلمپ بۆئەوەی ببێ بە مەیگێڕی خواکان. هۆمیروس بە (جوانترین مرۆڤ) وەسفی کردووە.

(٧) گلۆکون: ڕەخنەگر بوو. شتێکی وا لەبارەی بەرهەمەکانی نەماوەتەوە. هەندێ وای بۆدەچن کە برای ئەفلاتوون بوو بێ، ناوی لە گفتوگۆی (ئەیۆن)دا هاتووە.

(٨) ئیکاریوس: مەبەست باوکی (پێنێلۆپێ)یە.

(٩) تیلیماکوس: کوڕی ئۆدیسیوسە لە پێنێلۆپێ.

(١٠) کیفالینا: گەورەترین دوورگە بووە لە ڕۆژئاوای خاکی یۆنان هومیروس باسی کردووە. بنکەی (ئەتاکا) بووە کە ئۆدیسیوس حوکمی دەکرد.

(١١) ئیگیوس: یەکێکە لە کەسێتییەکانی شانۆگەری (میدیا).

(١٢) ئەم دوازدە مەسەلەیە تۆژەرەوەکانی زۆر ماندوو کردووە بۆ دۆزینەوەیان. بەکورتی ئەمانەن:

چەوتی لە پێناوی ئامانجدا/ چەوتی ڕاستەوخۆو چەوتی سەرەڕۆ/ لاساکردنەوەی ئەوەی دەبێ ببێ/ لاساکردنەوەی ئەوەی خەڵك بڕوایان پێیە/ لاساکردنەوەی کەتوار/ ئەوەی تەنیا گوتراوە یان تەنیا رووی داوە هیچ بایەخی بۆ دانانرێ/ بەکارهێنانی وشەی بیانی/ بەکارهێنانی خوازە/ گۆڕینی نەبرەی دەنگ/ بەکارهێنانی ژمارە بەندی/ لێڵی ماناو وشەی فرە واتا/ بەکارهێنانی زمانەوانی باو.

# پەراوێزەكانی بەشی بیستو شەشەم

(١) بڕوانە پەراوێزی ژمارە ( ١ )ی بەشی (١٥ ).

(٢) مینیسیكوس: خەڵكی خالكیس بوو. ئەكتەرێكی بەتوانا بوو. دەورە سەرەكییەكانی شانۆگەرییەكانی ئەخیلوسی دەدی بەتایبەتی لەوانەی دوایە.

(٣) كالليپیدیس: یەكێ بوو لە ئەكتەرەكانی شانۆگەرییەكانی سۆفۆكليس.

(٤) پندارۆس: ئەكتەرێكی نەناسراوە.

(٥) سۆسیتراتوس: سروودبێژێكی داستانی نەناسراوە.

(٦) مناسیتوس: سروود بێژێكی شیعری لیریكی نەناسراوە.

(٧) بۆشاری (ئۆپوس) دەگەڕێتەوە كە دەكەوێتە (لۆكریس)ی ناوەندی خاكی یۆنان. زێدی پاڵەوانی ئەفسانەیی تەروادە (پارتۆكليس) بوو.

تراجیدی لەبەر چوار ئەگەر لە داستان پایە بەرزترە:

أ- رەگەزی زۆرە.

ب- نواندنی زیندووترە.

ج- كورتترە (لەمەدای كاتو شوێندا).

د- یەكگرتنی تێدا بەهێزە.

(٩) لێرەوە باسی تراجیدی تەواو دەبێ و كتێبی (هونەری شیعر)ی ئەرەستۆ، ئەوەندەی لەبەردەستدایە، كۆتایی دێ. دەبێ كتێبەكە بەشێكی تریشی تێدا بووبێ لەسەر كۆمیدیو ئەیامبو، بەڵام نەمابێ.

# سەرچاوەکان

## یەکەم بەعەرەبی:

١ـ احسان عباس، فن الشعر، دار الثقافة، بيروت، بنان، ؟

٢ـ ارسطوطاليس، فن الشعر، ترجمة عبدالرحمن بدوي، دار الثقافة، بيروت، لبنان، ١٩٧٣.

٣ـ ارسطو، فن الشعر، ترجمة الدكتور ابراهيم حمادة، دار هلا للنشر والتوزيع، ١٩٩٩

٤ـ اميرة حلمي سلمى مطر، الفلسفة عند اليونان، دار النهضة العربية، القاهرة؟

٥ـ انردو روبرت برن، تأريخ اليونان، ترجمة محمد توفيق حسين، مطبعة التعليم العالي، بغداد، ١٩٨٩.

٦ـ اميل برهييه، تاريخ الفلسفة، الفلسفة اليونانية، ترجمة جورج طرابيشي، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، لبنان، ١٩٨٢.

٧ـ جورج تومسن، اسخيلوس واثينا، ترجمة الدكتور صالح جواد كاظم، وزارة الاعلام، بغداد، ١٩٧٥.

٨ـ د. جميل نصيف التكريتي، قراءة وتأملات في المسرح الاغريقي، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٥.

٩ ـ د. رشاد رشدي، نظرية الدراما من ارسطو الى الان، دار هلا للنشر والتوزيع ، ؟.

١٠ـ د. سهير القلماوي، فن الادب (١) المحاكاة، دار الثقافة، القاهرة، ١٩٧٣.

١١ـ د. شكري محمد عياد، كتاب ارسطو طاليس في الشعر، دار الكتاب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٧

١٢ـ د. عبدالجليل كاظم الوالي، نظرية المثل، مؤسسة الوراق للنشر والتوزيع، الاردن، عمان، ٢٠٠٢.

١٣ـ د. عبدالرحمن بدوي، الخطابة لارسطو، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٠.

١٤ـ د. علي الزبيدي، محاضرات في تاريخ الادب المسرحي، ط. المأساة اليونانية، مطبعة الجامعة ، بغداد، ١٩٧١.

١٥ـ فؤاد كامل و اخرون، الموسوعة الفلسفية المختصرة، بغداد، ١٩٨٢

١٦ـ فرنون هول، موجز تاريخ النقد الادبي، ترجمة الدكتور محمد شكري مصطفى و عبدالرحيم جبر، دار النجاح، بيروت، ١٩٧١

١٧ـ مارك شورو واخرون، النقد – اسس النقد الادبي الحديث، ترجمة السيدة هيفاء هاشم، ح ٢، دمشق، ١٩٦٦.

١٨ـ د. لويس عوض، نصوص النقد الادبي، اليونان، ج ١، دار العارف بمر، القاهرة، ١٩٦٥.

١٩ـ ول، ديورانت، قصة الفلسفة من افلاطون الى جون ديوي، ترجمة الدكتور فتح محمد المشعش، مكتبة المعارف ، بيروت،١٩٧١.

٢٠ـ وليام، ك، ويمزات وكلينيث بروكس، النقد الادبي، ترجمة حسام الخطيب ومحى الدين صبحي، ج ١، مطبعة جامعة دمشق، ١٩٧٣.

٢١ـ د. هنري توماس، اعلام الفلسفة، كيف نفهمهم، ترجمة متري امين، دار النهضة العربية، ١٩٦٤.

٢٢ـ يوسف كرم، تاريخ الفلسفة اليونانية، دار القلم، بيروت، لبنان.

## دووەم بەفارسی:

٢٣ـ م، چ، جی رز، تاريخ ادبيات يونان، ترجمة ابراهيم يونسي، مؤسسة انتشارات اميركبير، تهران، ١٣٧٢

٢٤ـ عبدالحسين زرين، كوب، ارسطو وفن شعر، مؤسسه انتشارات اميركبير، تهران ١٣٨١.

## سێیەم بەئینگلیزی:

25- Aristotle et al, Classical Literary Giticim, Translated by, T.S Darsch, Penguin Books, 1982

26- Aristotle, Ethics, Tr. J.A.K Thomson, Perguin ,Books, 1979.

27- Aristotle, On the art of poetry, Tr. Ingram bywater, Oxford press, 1909.

28- Adnan, K. Abdulla, Hisrory of Literary Critiasm, Mossul?

29- David Daiches, Critiacal Approaches to Literature Longman, london, 1975.

30-Dicctionary of Classical Mythology, Brochapton press, London, 1995.

